# دەوڵەتی ماد

٧٠٠-٥٥٠ پێش زایین





نووسینی
عومەر ئیسماعیل مارف

پێداچوونەوەو پێشەکی
د. کەیوان ئازاد ئەنوەر

# دەوڵەتی ماد

## ٧٠٠-٥٥٠ پێش زایین


نووسینی

**عومەر ئیسماعیل مارف**

پێداچوونەوە و پێشەکی

**د. کەیوان ئازاد ئەنوەر**



**چاپی یەکەم: سلێمانی**

٢٧١٠کوردی-٢٠١٠زایینی

# دەوڵەتی ماد

نووسینی: عومەر ئیسماعیل مارف

بابەت: مێژوویی

تایپ: عومەر

هەڵەچن: مامۆستا ڕێبوار جەمال

دیزاین: ئازاد حاجی

چاپی یەکەم: سلێمانی ٢٠١٠

چاپ: چاپخانەی پەیوەند

تیراژ: هەزار دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە ١٢٠٦ی ساڵی ٢٠١٠ی پێدراوە

# ناواخن

# پێشەکی

لە ڕۆژگارێکەوە، کە نووسین دۆزراوەتەوە ڕووداو و بەسەرهاتەکانی ژیان و گوزەرانی تاک و خێزانەکان لە مەترسی لەناوچوون ڕزگاریان بووە. ئەو مێژووە، کە خۆی لە (٣٥٠٠) ساڵ بەر لە زایین دەدات، گەورەترین هۆکاری دەربازبوونی مێژووی ژیانی سەراپای گیانەوەران بوو لە فەوتان، تا ئەوەی لەو ڕۆژگارە بە دواوە ڕووداو و بەسەرهاتەکان چوارچێوەیەکی تریان بە خۆوە گرت و باشتر کەوتوونە نێو ناوان. لێرەوە زانستێک سەری هەڵداوە، کە زۆر دواتر بە (زانستی مێژوو) ناسرا. ئەو زانستەی هەموو خەون و هیواکانی بووە تۆماری سەرجەم ڕووداو و بەسەرهات و داهێنان و بەرهەمە بەردەوامەکانی سەراپای تاکەکانی مرۆڤ لەسەر ڕووی زەوی.

لە پەراوێزی وەها ڕاستییەکی مێژووییدا گەنجێکی دەڤەری پشدەر و نەوەی (فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە) بە ناوی (عومەر ئیسماعیل باوزێیی) بەرهەمێکی خۆی بە ناوی (دەوڵەتی ماد) ئامادەکردووە. ئامانج لەو کارەی خستنەڕووی یەکێکە لە گەورەترین دەسەڵاتەکانی مێژوو، کە بۆ زیاتر لە (دوو هەزار و حەوت سەد) ساڵە ناسنامەی نەتەوەی کورد و سەروەری و مانییەتی، تا ئەوەی تاکە ساڵنامەی نەتەوەی کورد، کە (ساڵنامەی کوردی)یە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی ماد دەگەڕێتەوە، کە (٧٠٠) ساڵ پێش زایین لەسەر دەستی (دیاکۆ)ی یەکەم پادشای ماد دامەزرا.

ئەم بەرهەمەش وەک ئاماژەمان پێدا هەوڵێکی دڵسۆزانەی کاک عومەرە، هێنرایە لای من تا کاری پێداچوونەوەی بۆ بکەم زۆر دڵخۆشی کردم، کە رۆڵەیەکی نێو نەتەوەکەم خەمی رابردوو کە یەکەمین ناسنامەی کوردبوونمان و ئایندەمانە. هەر بۆیە بە خۆشحاڵییەوە ئەرکی پێداچوونەوەیم بۆ کرد و ئەم چەند دێرەم وەک پێشەکی بۆ نووسی. بە ئومێدی ئەوەی ئەم کارەی سەرەتای کۆمەڵێک بەرهەمی ناوازەی تری بێت لە داهاتوودا.

**د.کەیوان ئازاد ئەنوەر**

**١٥ی مارتی ٢٠١٠ز**

**سلێمانی**

## باسی مادەکان بۆچی؟

مەبەستی سەرەکیم لەم بابەتە، ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵە و ناڕاستیانەیە، کە مێژوونووسە بێگانەکان بە مەبەستی تایبەت یان بۆ ناشیرینکردن و سڕینەوەی دێرینیەتی کورد، بەشێوازی جۆراوجۆر مێژووی کوردیان نووسیووەتەوە و دێرینی نەتەوەکەمانیان شێواندوە و چەواشەیانکردووە، هەر چەندە لە ئێستادا، زۆرێک لە شارەزایان و پسپۆڕانی بواری مێژووی کورد، لە هەوڵی ڕاستکردنەوەی ئەو نووسراوانەدان، کە تایبەتن بە مێژووی کورد، خەریکی گەڕانن بەدوای سەرچاوەی تازە و نەنووسراودا.

ئاشکرایە نەتەوەی کورد، دێرینترین و ڕەسەنترین نەتەوەیە، لە ناوچەکانی دۆڵی نێوان دوو ڕووباری کۆن و خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی ئێستادا، بەڵام لەبەرئەوەی، کە هەر لە کۆنەوە، هیچ کاتێک باپیرانمان درکیان بەوە نەکردووە و ڕۆشنبیرییەکی ئەوتۆیان نەبووە، کە ڕووداو و بەسەرهاتەکانیان بەدەستی خۆیان بنووسنەوە و تۆماریان بکەن، بۆیە میژووی کورد لەلایەن خەڵکانی بێگانە و نەیاران و دوژمنانی کوردەوە نووسراوەتەوە، ئەوانیش بە ئارەزووی خۆیان زیاد و کەمیان تیادا کردووە، لە شێوەی ئەفسانەدا مێژووەکەیان داتاشیووە، کوردیان بە نەوەی جن و ئەژدیها داناوە، کورد و نەتەوەکانی تریان پێچەواشەکردووە، بۆیە لە ئێستادا، هیچ کەسێک لە ئێمە ڕاستی و دروستی ڕابردوو و مێژووی نەتەوەکەی وەکو پێویست نازانێت، خەڵکانی تریش و نەتەوەکانی دەورووبەریشمان دان بە بوون و ڕاستی بوونمان دانانێن.
کەس نییە لە ئێمە ناوی مادەکان و دەوڵەتی مادی نەبیستبێت، کە ئێستا بۆمان بووە بەمێژوویەکی پڕ لە سەروەری، هەموو تاکێکی کورد شانازی پێوە دەکات، بەڵام بەداخەوە ئێستا مێژووی ئەو دەوڵەتە بەهێز و گەورەیە، بەجۆرێک شێوێنراوە، کە بەشێکمان گومان لە ڕاستیبوون و بەسەرهاتەکەیان

دەکەین، چونکە هەرچی مێژووی ژیان و بەسەرهاتی (ماد)ەکانە، زیاتر لە دوو سەرچاوە وەرگیراوە، کە ئەوانیش پەرتوک و مێژووەکەی (هیرۆدۆت)ی مێژوونووسی بەناوبانگی یۆنانییە، کە بە باوکی مێژوو ناسراوە، نووسراوەکەی هیرۆدۆت دەتوانرێت جێگای باوەڕ و پشت پێبەستن بێت، لەبەرئەوەی هیرۆدۆت زۆر بێلایەنانە مێژووی مادەکان و چەند نەتەوەیەکی تری ناوچەکەی تۆمارکردووە، هەروەها ئەو سەردەمەی ئەو تێیدا ژیاوە، زۆر دوای ڕوخانی دەوڵەتی مادەکان نەبووە. بۆیە ئەوکاتە هیرۆدۆت وەکو کەسێکی ئاگادار و نزیکی سەردەمی ڕووداوەکان دەماودەم ڕووداو و بەسەرهاتەکانی، لە خەڵکی ناوچەکە وەرگرتووە و نووسیوویەتی. کە چۆن (هارپاک)ی سەرلەشکری پاشای ماد، خیانەتی لە پاشاکەی کردووە و بووەتە هاوکار بۆ خەڵکانی تر، نەخشەو پلانی لەناوبردنی دەوڵەتەکەی داناوە. هەرچی سەرچاوەکەی تریشە، شانامە ئەفسانەییەکەی فیردەوسییە، کە ساڵی (١٠٠٠ز)، واتە، دوای (١٥٠٠) ساڵ لە نەمانی مادەکان، بێ ویژدانانە میژو و ژیانی پاشاکانیانی بە شێوەی ئەفسانە و بە بەیت و هۆنراوە، بۆ (سوڵتان مەحمودی غەزنەوی) نووسیووە، کە هەتا ئێستاش لە ناو زۆرێک لە مێژوونووسان و ڕۆشنبیرانی ئێمەدا، شانامەکەی (فیردەوسی) بەڕاست دادەنرێت، وەکو سەرچاوە بەکاردەهێنرێت. ئەوەی کە لەسەر مادەکان نووسراوە، لەلایەن فیردەوسییەوە، بەتایبەت ژیانی چوارەم پاشای مادەکان ئاشداهاک، کە ئەو بە (زوحاک) ناوی بردووە، بەپێیی شانامە لە لایەن (کاوەی ئاسنگەر) ناوێکەوە سەری پانکراوەتەوە. لەڕاستیدا ئەو بەسەرهاتە بەوشێوەیە نییە، چونکە هیچ بنەما و بنچینەیەکی ڕاست و زانستی نییە، تائێستا هیچ لێکۆڵینەوەیەک نەیسەلماندووە و نەبیستراوە و نەنووسراوە، بەدرێژایی مێژووی جیهان، کەسێک مار لەسەر شانەکانی هەبێ و مێشکی مرۆڤ خواردنیان بێت. بەداخەوە لە ئێستادا لە لای زۆرێک لە

ئێمە بەشانازییەوە باس لە ئازایەتی کاوە دەکرێت و بە قارەمانێکی کورد ناسێندراوە، زوحاکیش بە خوێن مژ و فارس ناوبراوە.

لە لایەکی تریشەوە، هیچ گومانی تێدانییە کە ئایینی (زەردەشت)ی ئایینێکی ئاسمانییە، وەکو زوربەی ئایینەکانی تر. هەروەها (زەردەشت) پەیامبەریش، لەو نەتەوەیە بووە کە ئێستا پێیی دەگوترێت کورد. (زەردەشت)، لە سەدەکانی پێش زایینـدا لەلایەن ئاهورامەزدا (خوا)وە بۆ ئامۆژگاریکردنی کۆمەڵگای ئەوکاتە، دەستنیشانکراوە و ڕاسپێردراوە. پەیامێکیشی بۆ نێردراوە بەناوی (ئاڤێستا). کەچی لە ئێستادا ئەو ئایینە جوانە بە ساختە و دەستکرد دادەنرێت و زۆرێکیش لە ئێمە وەکو کورد (زەردەشت) و ئایینەکەی بە نەبوو و درۆ دەزانین. هۆکاری ئەو نامۆبوونەش بە ئایینی (زەردەشت)ی و خودی (زەردەشت) پەیامبەر ئەوەیە، کە دوای وەفاتی (زەردەشت) و سوتان و بەتاڵانبردنی پەڕتوکی پیرۆزی ئاڤێستا، لەلایەن سوپاکەی ئەسکەندەری مەکەدۆنییەوە، جارێکی تر پەڕە پەرتوبڵاوەکانی ئاڤێستا لەلایەن خەڵکانی نەشارەزا بە ئایینەکە بە تایبەت موغ و موبیدە (زەردەشت)ییەکان، لە سەردەمی ئەشکانی و ساسانییەکاندا کۆکراوەتەوە. ئەوکاتە بەشەکانی ئاڤێستایان بۆ مەرام و خواستی پاشاکانیان لێکداوەتەوە و نووسیووەتەوە. بەو هۆیەوە ئایینەکەیان شێواندووە. هەندێک شت کە وەک نەریت لە ئایینە کۆنەکاندا باو بووە یان لەناو جادوگەرەکاندا گرنگی پێدراوە، ئەوان تێکەڵاوی ئایینەکەیان کردووە، وەک پەرستنی ئاگر. هەربۆیە دواتریش عەرەبە موسڵمانەکان، (زەردەشت)ییەکانیان بە (مەجوسی) و ئاگرپەرست ناوبردووە، گوایە (زەردەشت)ییەکان ئاگرپەرستن. بەو بیانووە جارێکی تر ئاڤێستایان سوتاندووە و لەناوبردووە.

ئەمە و چەندین هۆکاری تر منی پەلکێش کرد، کە بەپێیی توانا و ئاستی

شارەزایی خۆم و دەستکەوتنی سەرچاوەی باوەڕپێکراو، ئەو هەڵە و ناڕاستیانە بۆ خوێنەرانی کورد ڕاست و ڕوونبکەمەوە. ئەم باسەی کە ئێستا لە دوو توێیی ئەم پەرتوکەدا دەیبینن، بەرهەمی کار و ماندووبوونی سێ ساڵ لەمەوپێشە، کە لەوماوەیەوە خەریکی کاربۆکردن و خوێندنەوە و گەڕان بووم بەدوای سەرچاوەدا، لەڕاستیدا، هیچ مرۆڤێک لە جیهاندا ناتوانێت خۆی و بەرهەمەکانی لەهەر بوارێکدا بێت بێ کەموکورتی بن و جێگای ڕەزامەندی هەموو کۆمەڵگە بن، بۆیە منیش دڵنیام کە ئەو بەرهەمەم بێ کەموکورتی نییە، بەڵام هیوادارم بەم کارەم توانیبێتم ڕاستی ژیان و گوزەرانی سەردەمی فەرمانڕەوایی مادەکان و بەشێک لە ژیان و ئایینی (زەردەشت) پەیامبەر بۆ عاشقان و شەیدایانی مێژووی نەتەوەکەمان و خوێنەرانی خۆشەویستی کورد ئاشکرا بکەم و توانیبێتم کەلێنێک لە بۆشایی کتێبخانەی کوردی پڕبکەمەوە.

هیواخوازم پسپۆڕانی بواری مێژوو، لە هەر ڕەخنە و کەموکورتییەکم ببورن، چونکە ئەمە یەکەم ئەزموون و یەکەم بەرهەمی نووسینمە، هیوادارم شارەزیان بە تێبینیی و سەرنجەکانیان زیاتر هانم بدەن، بۆ ئەوەی لە کارەکانی داهاتوومدا، کەڵک لە ئامۆژگارییەکانیان وەربگرم. لە کۆتایدا زۆر سوپاسی یەکەیەکە ئەو دۆست و هاوڕێیانە دەکەم، کە لە کۆکردنەوە و نووسین و ئامادەکردنی ئەو پەرتوکەدا یارمەتیاندام و هاوکارییان کردم، لە پێدانی سەرچاوە و پەیداکردنی کتێب و وێنەکان، تەنانەت ئەگەر بە وتەیەکی باشیش بوبێت.

**عومەر ئیسماعیل باوزێیی**
aumerasmail@yahoo.com
**٢٠٠٩/١٠/٥ قەلادزێ**

## بەشی یەکەم

# دەوڵەتی ماد (٧٠٠-٥٥٠) پێش زایین

## کۆچکردن و بڵاوبوونەوەی هیندۆئەوروپاییەکان

کۆچکردنی نەتەوە جیاجیاکانی نەژادی هیندۆئەوروپایی (٣٠٠٠) ساڵ پێش زایین، لە زێدی خۆیانەوە، بۆ سەر زەمینەکانی وڵاتانی ئەوروپا و ئاسیا، زیاتر بەهۆی نالەباری کەش و هەواوە بووە، کە بەو هۆیەوە ئەو کاتە لە زوربەی وەرزەکانی ساڵدا، سەرمای لەڕادەبەدەر و بەدوای ئەویشدا، ئەو ناوچانە بوونەتە سەهۆڵ و بەستەڵەک بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ، هەروەها هۆیەکی تری کۆچکردنی ئەو نەتەوانە، بێتوانایی ئەوان بووە لە بەرامبەر زوڵموزۆری و داگیرکاری نەتەوەی (ئیلیری) و نەتەوەکانی تری نیوەدورگەی (باڵکان)، کە لەو کاتەدا ئەو هێرش و داگیرکارییانە بەشێوەیەکی پچڕپچڕ ڕوویانداوە، لەئەنجامدا، ئەو نەتەوانە لە باکووری خۆرهەڵاتی دەریای (ئادریاتیک) نیشتەجێبوون، هیندۆئەوروپاییەکانیش ناچاربوون، بە چۆڵکردنی ناوچەکانی خۆیان و کۆچکردنیان بۆ سەرزەمینەکانی تر.

بەو شێوەیە مێژوونوسان لە ڕووی کاتەوە، یەکەم کۆچی نەتەوەکانی هیندۆئەوروپایی، بەسەردەمی دوای بەرد، یان چاخی بەردینی نوێ (نیۆلیتیک) دەزانن، ئەو کاتە هیندۆئەوروپاییەکان لە دوو سەردەمی جیاوازدا دەستییان بەکۆچکردن کردووە، لە کۆچکردنەکەیاندا عەرەبانەی ئەسپییان بەکارهێناوە، بۆ بارکردن و گواستنەوەی ئازوخە و کەلوپەلی شەڕ و هتد... لەوکاتەدا، ئەوان بۆ دوو دەستەی کۆچکردن دابەشبوون:

دەستەی یەکەمیان، بۆ سەرزەمین و ناوچەکانی تری ئەوروپا کۆچیانکردووە، هەروەها دەستەی دووەمیش، ئەوانەبوون کە بەناوچە و سەرزەمینەکانی ئاسیادا بڵاوبوونەتەوە. ئەو دەستەیەش لە کۆچەرانی هیندۆئەوروپایی، بۆ سەرزەمینەکانی ئەوروپا، بەو شێوەیەی خوارەوە، بۆ (حەوت) لک دابەش بوون:

١. (سلّتەکان، ئیّرلەندییەکان و گولّنەکان).

٢. (گلۆنییەکان، ئیسکۆتلەندییەکان و بیرتنەکان)، کە ئەوانە بەرەو باکوور و باشووری خۆرئاوای ئەوروپا ڕۆیشتوون.

٣. (سلاڤییەکان) کە (ڕووسەکان، بولّگارییەکان و پۆلّەندییەکان) دەگرێتەوە، ڕێگای باکووری خۆرهەلاّت و خۆرهەلاّتی ئەوروپایان گرتۆتەبەر.

٤. (لاتینییەکان) ئەوانەش لە کەنارەکانی دەریای (میدیترانە) سپی ناوەڕاستی ئێستادا، لە ولاّتی (یۆنان) و سەرزەمینەکانی ڕۆمای کۆن نیشتەجێبوون.

٥. (ژەرمەنەکان یان ئەلّمانییەکان)، لە خۆرهەلاّتی ڕووباری (ڕایین)، لە ئەلّمانیای ئێستادا، هەتا سەرزەمینەکانی نیوەدوورگەی ئەسکەندەنافیا نیشتەجێبوون.

٦. (دانیمارکییەکان، نەرویژییەکان و گۆتیکەکان) یش، بەلکی باکووری ژەرمەنەکان ناسراون.

٧. لەتەنیشتی ئەوانیشەوە (لیتوانییەکان و ئیستۆنییەکان)، بەلکی خۆرهەلاّتی ژەرمەن دەژمێردرێن. جێگای ئاماژەیە، کە هەندێک لە ڕەگەزناسان پۆلّەندییەکانیش بە بەشێک لەو لکە دادەنێن.



**دابەشبوونی جوگرافی هیندۆئەوروپاییەکان لە ولاّتانی ئەوروپا**

کۆچەرە ئاسیاییەکانیش دووبارە بۆچەند دەستەیەک دابەش بوون:

١. لکێکیان لە ڕێگای سەرزەمینەکانی یۆنانەوە درێژەیان بە کۆچکردنی خۆیانداوە. لکەکەی تریش لە دوو ڕێگاوە هاتوونەتە سەرزەمین و ناوچەکانی ئاسیا، دەستەیەکیان بە دەووری دەریای (ئەژە) ڕەشی ئێستادا، سووڕیان خواردوە و دوای ئەوە بە دەربەندی (بسفۆڕ و داردانیل) ی ناوچەکانی (قەفقاز)ی ئێستادا تێپەڕیوون و چوونەتە ناوخاکی (ئاسیایی بچوک)، وڵاتی تورکیای ئێستا و سەرزەمینی (ئاناتۆلی)، دواتر بەشێکیان بەرەو باکووری خۆرهەڵاتی دوورگەکانی دەریای میدیترانە ڕۆیشتوون. یۆنانییەکان لە بەڵگەنامە و ئاسەوارەکانی خۆیاندا ئەوانەیان بە (فریگییەکان) ناوبردووە، بەپێی سەرچاوەکان ئەو کۆچەیان لە نێوان کۆتایی هەزارەی چوارەم، هەتا ناوەڕاستی هەزارەی سێیەمی پێش زایین واتە، (٣٠٠٠ - ٢٥٠٠ پ. ز) بووە.

٢. گروپەکەی تریش یان دەستەی دووەم لەو کۆچەرانە، بە نەتەوەکانی باکووری دەریای ئەژە و ناوچەکانی قەفقاز واتا سەرزەمینەکانی خۆرئاوای دەریای (خەزەر- مازەندەران) قەزوینی ئێستا ناسراون، بەشێکی تریش لەو لکەی هیندۆئەوروپاییەکان بە بڕوای مێژوونووسان، لەڕێگای سەرزەمینەکانی وڵاتی (تورکمنستان)ی ئێستاوە درێژەیان بە ڕۆیشتنداوە، بۆ ناوچەکانی ئێستای (ئێران و هیندستان)، دواتر ئەوانە ناوچەکانی خۆرهەڵات و باکووری ئێرانی ئێستا و لاپاڵی شاخەکانی (هیندوکوش)، لە وڵاتی (ئەفغانستان) و ناوچەی (بلوچستان)ی ئێستا، هەتا سەرزەمینەکانی نزیک ڕووباری (سند)، بەشی خۆرئاوای وڵاتی (پاکستان) ی ئێستایان بۆ نیشتەجێ بوونی خۆیان تەرخانکردووە.

تویژەرەوان هەزارەی دووەم و یەکەمی پێش زایین، بە چوونی لکی ئارییەکانی هیندۆئەوروپایی دەزانن، بۆ لاپاڵی شاخەکانی (زاگرۆس) و ناوەندی وڵاتی ئێرانی ئێستا.

ئەمەو دیسانەوە دەستەیەکی تریش لە ئەوان، بە شاخەکانی قەفقازدا تێپەڕیوون، هەتا کەنارەکانی ڕووباری فورات، ئەوانە دواتر لەگەڵ نەتەوەی (سوئیەکان -

هوورییەکان) تێکەڵاو بوون، دواتر شارستانییەت و نەتەوەی (میتانییەکان)یان دروستکردووە.

کۆچکردنی هیندۆئەوروپاییەکان لە قۆناغی دووەمدا، لە سنووری کۆتایی هەزارەی دووەمی پێشزایین، هەتا نزیکی ساڵی (١٢٠٠ پ. ز)، دووبارە و لە هەمان ڕێڕەوی پێشوتریانەوە، دەستیان بە کۆچکردن کردۆتەوە، بۆ سەرزەمینەکانی ئاسیا، پاشان ئەوکۆچەرانە لەگەڵ نەتەوەکانی (تراکییەکان، فریگییەکان، ئەرمەنییەکان، میسیان و ساکییەکان) تێکەڵاوبوون، دواتر دەسەڵات و فەرمانڕەوایی (هیتییەکان) یان لە ناوچەکانی ئاسیایی بچوکدا لەناوبردووە.

لکێکی تریش لە ئەوان بەناوی (فەلەستینییەکان)ەوە، چوونەتە کەنارەکانی خۆرهەڵاتی دەریای میدیترانە. لکێکی تریشیان بەناوی (دوورییەکان)، لەڕێی وشکانییەوە گەیشتونەتە سەرزەمینەکانی (میسر) و لەگەڵ نەتەوە نیشتەجێبووەکانی ئەو ناوچەیە بەشەڕهاتوون، دوای سەرنەکەوتنیان بەسەر نەتەوە نیشتەجێبووەکەی سەرزەمینی میسردا، بۆ سەرزەمینی یۆنانی ئێستا پاشەکشەیان کردووە، دواتر هەردوو شارستانییەتی (کرت و میس)ی یۆنانییەکانیان لەناوبردووە.



**دابەشبوونی جوگرافی هیندۆئەوروپاییەکان لە وڵاتانی ئاسیا**

گروپە سەرەکییەکانی ئاری هیندۆئەورووپایی سەرزەمینەکانی ئاسیا، لە (هیندییەکان، مادەکان، پارسەکان، سەغدییەکان، سکیتییەکان، سامارتییەکان، کیمیرییەکان، کلیکییەکان، ئەشکانییەکان، موسییەکان، کوکییەکان، فەلەستینییەکان، میتانییەکان، ئورارتوویییەکان و فریژییەکان) پێکهاتوون. بە گوێرەی هەمان هەڵسەنگاندن، میتانییەکان بە دێرینترین نەتەوەی نەژادی ئاری هیندۆئەورووپایی ناسراون لە ناوچەکەدا. لەو سەردەمەدا، ژیانی هیندۆئەورووپاییەکان لە شێوەی تیرە و هۆزی بچوک و کۆچەریدا بووە، دواتر بەرەبەرە ڕوویانکردۆتە گوندنشینی و لەدوایشدا شارنشینی، ئینجا چەند دەوڵەتێکی بچوک و سەرەتاییان دروستکردووە. جێگای ئاماژەیە کە پێش هاتنی نەتەوەکانی ئاری نەژادی هیندۆئەورووپایی، بۆ ئەو ناوچانەی کە پێشتر لەسەر زەمینەکانی ئاسیادا باسمانکرد، بوونی چەند نەتەوە و ڕەگەزێکی تر لەو ناوچانە پشتڕاستکراوەتەوە، هەتا نیوەی یەکەمی هەزارەی یەکەمی پێش زایین، کە ئەوانیش بەو شێوەیەی خوارەوە دەکرێن بەچەند بەشێکەوە:

١. (کادوسییەکان، گیلانییەکان، تەپورییەکان، ماردانییەکان و کاسپییەکان)، ئەوانە نیشتەجێیی سەرزەمینی کەنارەکانی دەریای قەزوین بوون، کە ئەوکاتە، ئەو دەریایە بەدەریای (کاسپین) ناسراوە.

٢. (گۆتییەکان، خورییەکان، سوئییەکان و لۆلۆییەکان)، ئەوانە خەڵکانێک بوون، کە لە نێوان ناوچەکانی دەورووبەری دەریاچەی (چیچێست) ئورومییەی ئێستا، هەتا ناوچەکانی سەرووی ڕووباری (کەرخە)، سیروانی ئێستا نیشتەجێ بوون.

٣. (ئیلامییەکان و کاشییەکان)، لەناوچەکانی باشووری ڕووباری سیروان نیشتەجێ بوون.




**نەخشەی نەتەوەکانی پێش هاتنی هیندۆئەوروپاییەکان.**

## کۆمەڵەی زمانەکانی هیندۆئەوروپایی

یەکەم: کۆمەڵەی ئارییایی پێکهاتووە لە (کوردی، فارسی، پشتۆنی، تاجیکی، ئوسیتی و بلوجی).

دووەم: هیندی (سانسکریتی[1]، هیندی، ئوردوویی، بەنگالی، پەنجابی، ماراتی، گوجاراتی، بەهاری، راجاستانی، ئووری، سامی، کشمیری، نیپاڵی، سندی، سەنهالی، بهێلی، ڕۆمانی (قەرەجی) و مۆڵداڤی).

سێیەم: ئەڵمانی خۆرهەڵاتی (سویدی، دانیمارکی، نەرویجی، ئایسلاندی، فیروی و گۆتی[2]).

ئەڵمانی خۆرئاوایی (ئینگلیزی، ئەڵمانی، دیشی، هۆڵەندی، فلامی، فریسی و لۆکسمبۆرگی).

چوارەم: لیلتی- گودیلی (ئێرلەندی و سکۆتلەندی).

پێنجەم: بریتونی (وێڵزی و بریتونی).

شەشەم: ئیتالی یان ڕۆمایی (ئیتالی، فەرەنسی، ئیسپانی، پورتوگالی، کتالانی، سردینی و لاتینی).

حەوتەم: هیتیی[3].

هەشتەم: یۆنانی.

نۆیەم: بەلتیکی (لیتوانی و لاتیڤی).

دەیەم: سلاڤی خۆرهەڵاتی (ڕووسی، ئۆکرانی و بیلاڕووسی).

سلاڤی خۆرئاوایی (پۆڵۆنی، چیکی، سلۆڤاکی و سووربی).

یازدە: ئەلبانی.

دوازدە: ئەرمەنی.

١. سانسکریتی: ئێستا ئەو زمانە بەکارنایەت و لەناوچووە.
٢. گۆتی: ئێستا ئەو زمانە بەکارنایەت و لەناوچووە.
٣. هیتیی: ئێستا ئەو زمانە بەکارنایەت و لەناوچووە

## ناساندنی چەمک و وشەی ئاریایی

وشەی ئاریی بە چەند بۆچونێکی جیاواز لێکدراوەتەوە، وەک (ڕەسەن، خانەدان یان میواندۆست و ئازاد). ئارییەکان لە وەچەی (یافسی کوڕی نوح) پەیامبەرن، گرنگترین ڕەگەزی سپی پێستن و بەوناوچانەی کەپێشتر باسمانکرد بڵاوبوونەتەوە. وڵاتی ئێرانی ئێستا سەرزەمینی دیاری ئاریاییەکانە، لەکۆندا، پێش هاتنی ئارییە هیندۆئەوروپاییەکان، بۆ ئەو سەرزەمینە، بەوناوچەیە گوتراوە، (سفن)، دواتر بە (ئیریانا، ئیریانام، ئێریانم، ئایریان و ئایران)، ناوبراوە، ئینجا ناوەکە بۆ ئێران گۆڕدراوە، کە بەواتای نیشتمانی ڕەسەنی ئارییەکان دێت.

## سەرزەمینی وڵاتی ماد

لە کۆتایی ساڵەکانی سەدەی هەشتەمی پێش زایین، لە باشووری خۆرهەڵاتی دەریاچەی (چیچێست یان ئورومییە -ڕەزاییە)، واتا ناوچەکانی خۆرهەڵاتی کوردستان، دەوڵەتێکی بەڕەگەز ئاریی، بە ناوی دەوڵەتی (ماد) دامەزراوە، دواتر بەشێکی زۆری خاکی کوردستانی گەورەی ئێستا کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوا و پاشایانی ئەو دەوڵەتە.

یەکەم نەتەوەی خزم لەگەڵ مادەکان (پارسەکان) فارسەکانن، کە ئەو کاتە، پارسەکان لە باشووری سەرزەمینەکانی وڵاتی ماد، لە ناوچەکانی (پارسوماش)، لە ناوچەی (فارس) ی ئێستای ئێران نیشتەجێ بوون.

## لە ڕووی سنوری جوگرافییەوە

سەرزەمینەکانی ماد، لە خۆرهەڵاتییەوە، دەشتی (کوییر) بووە، لە ناوچەی (خوراسان)ی ئێستای ئێران، لە باکووری خۆرهەڵاتییەوە لوتکە شاخەکانی (ئەلبورز)ی ئێستا لە باشووری دەریای قەزوین، لە باکوورەوە ڕووباری (ئەرکسس) ئاراسی ئێستا و وڵاتی (ئەرمەنستان)، دەوڵەتی (ئاشوور)، لە لای خۆرئاوا، لە باشووریشیەوە سەرزەمینەکانی پارس و وڵاتی (ئیلام) بووە، کە ئێستا ئەو ناوچەیە بەشی باشووری پارێزگای ئیلامە، لە باشووری خۆرهەڵاتی کوردستان.

ئەو کاتە هۆزەکانی ماد، لە سنوورێکی زۆر فراوانی جوگرافیدا ژیاون، کە هەموو پارێزگای (ئازەربایجان) ی ئێستا و تەنانەت بەشێک لە پارێزگای (گیلان) و ناوچەکانی ناوەندی ئێستای ئێران، واتە، سەرزەمینەکانی (ڕەی[1]) و ناوچەکانی (ئیسفەهان) و (لوڕستان) ی ئێستا و پارێزگاکانی کوردستان (سنە) و (کرماشان) یش، لە خۆرهەڵاتی کوردستان لەو سنوورەدا بوون.

درێژیی ئەو وڵاتە، لە باکوورەوە بۆ باشوور (٥٥٠) پێنج سەد و پەنجا میل، پانییەکەشی لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا، (٢٥٠ - ٣٠٠) دوو سەد و پەنجا بۆ سێسەد میل بووە، هەروەها ڕووبەری سەرتاسەری ئەو وڵاتە (١٥٠٠٠٠٠) ملیۆنێک و پێنج سەد هەزار میل چوارگۆشە بووە. لەو کاتەدا، ئەو سەرزەمینە دابەش بووە بۆ سەر دوو ناوچەی جیاواز، یەکێکیان پێیی گوتراوە (ئاتروپاتن)[2]، بەشەکەی تریشی (مادی گەورە). سەبارەت بە بەشی یەکەم، زەویەکانی باکوور بووە، کە

---

١. ڕەی: ئەوکاتە ئەوشارە لە بناری شاخی ئەلبورز و باکووری شاری تارانی ئێستای ئێراندا هەڵکەوتووە، یەکێك لە شارە گەورە و گرنگەکانی وڵاتی ماد بووە.

٢. ئاتروپاتن: لە دوو وشەی کوردی پێکهاتووە، (ئاتر) واتا ئاگر. (پات) واتا جێگاو شوێن و ماڵ یان (ئاگرخانە). پاشان ناوی ئەو وڵاتە لە ڕووی دەربڕینەوە بووە بە (ئاتر و پاتگان). یۆنانییەکانیش گوتوویانە (ئازر و پاتگان). دوای داگیرکردنی ئەو ناوچەیە لەلایەن عەرەبە موسڵمانەکانەوە ئەوانیش پێیان گوتووە (ئازەر بایجان).

کەوتۆتە نێوان دەریای قەزوین و شاخەکانی زاگرۆس، هەتا کێوی دەماوەند، لە باکووری ئێستای تاران، ناوچەکانی دەریاچەی چیچێست، کە بەشێک لەو ناوچەیە ئێستا وڵاتی (ئازەربایجان) و پارێزگای ئازەربایجانی خۆرئاوا دەگرێتەوە، لەباکووری خۆرئاوای ئێران، ڕووبەری ئەو بەشە (۳۰۰) سێسەد میل چوارگۆشە بووە. بەشی دووەمیش، واتا مادی گەورە کەوتۆتە باشووری خۆرهەڵاتی ئاتروپاتن.

(ئەکباتان)[۱]یش کە ئێستا بە شاری هەمەدان لە وڵاتی ئێران ناسراوە، پایتەختی هەردوو بەشەکە بووە، ڕێڕەوێکی کاروانچیان، کە ئەوکاتە لە (بابل)[۲]ەوە، بۆ ئەکباتان هاتووە، دوو ناوچەی سەروو و خواروی مادی لەیەک جیاکردۆتەوە. سەرچاوە جوگرافییەکانی یۆنانی و ڕۆمی دێرین، تەنانەت سەرچاوەی سوریانیش ناوچەی (سەرپێڵی زەهاو) یان بە جوداکەرەوەی دووبەشی سەروو و خوارووی ماد داناوە. لەو کاتەدا، چەند شارێکی گەورە و ئاوەدانی مادەکان بەرچاو کەوتوون وەک، شاری ئەکباتانی پایتەخت، شاری ڕەی، (سوریکاش) شاری سەقزی ئێستا، (لامسی) لەسەر ڕووباری جەغەتووری ئێستا لە خۆرهەڵاتی شاری سەقز، (ئوئیشدیش)، لە خۆرهەڵاتی دەریاچەی چیچێست، شارەکانی (ئاریانش) و (ئارشتەیانا).

ئەو کاتە ئەو سەرزەمینە بە زمانی ئاشووریی (ئامادای- ماتای)، بەزمانی عیبریی (مادای)، بەزمانی پارسی (ماد)، بەزمانی یۆنانی (مدی) ، بەزمانی ئەرمەنی (مار - ک یان پارتی مات) و بەزمانی ئیلامیی تازەش، (ماتایە) ی پێگوتراوە.

۱. ئەکباتان: بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان پێش مادەکان بەو شارە گوتراوە (ئەکسیا)، دواتر ئاشوورییەکان پێیان گوتووە (ئامادانا). فارسەکانیش پێیان گوتووە (هنگماتانا)، کە لە وشەی (هەمەدانان-هەمەزانان) ی کوردییەوە هاتووە، واتا شاری زانا و ئاقڵمەندان. ئەو شارە ساڵی (۷۰۱پ. ز) شوێنی کۆبوونەوەی سەرۆک هۆزەکانی ماد بووە، بۆ دیاریکردنی (دیاکۆ) وەک یەکەم پاشای ماد. وشەکە لە دوو بڕگەی (هیکبا) واتا کۆبوونەوە. (تانا) واتا خەڵك پێکهاتووە. کە وشەیەکی کۆنی ئارییە.

۲. بابل: ئەو شارە بە (حلله) ش ناو دەبرێت. شارەکە لەسەر ڕووباری فورات هەڵکەوتووە و ناوی ڕووبارەکە دەیکات بە دوو بەشەوە، بە دووری (۱۰۰کلم) دەکەوێتە باشووری بەغدای پایتەختی وڵاتی عێراق. سەردەمێکی زۆر پایتەختی دەوڵەتی (ئەکەدییەکان) بووە، دواتریش وەکو پایتەختی زستانەی دەوڵەتی هەخامەنشییەکان ماوەتەوە هەتا هێرشەکەی (ئەسکەندەری مەکەدۆنی). (نووسەر).

## تیرەو هۆزەکانی ماد

بە پێیی باسکردنی (هیرۆدۆت)[1]، مادەکان پێش یەکگرتن و دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان، لە شەش هۆزی سەرەکی لە گوندەکان پێکهاتوون، کە بەشێوەیەکی پەرتوبڵاو ژیاون. ئەوانیش هۆزەکانی (بووسییەکان، پارتاکتەکان، سترۆخاتییەکان، ئاریزانتەکان، بوودییەکان و موغەکان) بوون، ئەو کاتە ئەو هۆزانە بەو شێوەیەی خوارەوە، بەسەر ناوچەکانی وڵاتی ماددا دابەشبوون:

١. **بووسییەکان**: سەرەتا لە ناوچەکانی دەوروبەری دەریای قەزوین ژیاون، دواتر بەرەو سەرزەمینەکانی ئەکباتان و ئێراقی ئێستا کۆچیانکردووە.

٢. **پارتاکتەکان**: ئەو هۆزە لە نزیک شاری ئیسفەهانی ئێستا ژیاون، کە ئەو کاتە ئەو شارە (ئەسپدان) ی پێگوتراوە.

٣. **سترۆخاتییەکان**: لە ناوچەکانی (سەمەرقەند و خوارەزم) بەکشتوکاڵکردن و ئاژەڵدارییەوە خەریک بوون.

٤. **ئاریزانتەکان**: لە سەرزەمینەکانی پارێزگای ئازەربایجان و ئەو دیووی ڕووباری ئاراس، واتا وڵاتی ئازەربایجان نیشتەجێبوون. ئەوانە یەکێکن لە گرنگترین هۆزەکانی ماد، کە لە نەخشەسازیدا زۆرشارەزا بوون.

٥. **بوودییەکان**: شوێنی نیشتەجێبوونیان لە ئەوپەڕی ناوچەکانی خۆرئاوای وڵاتی ماددا بووە.

---

١. هیرۆدۆت - هیرۆدۆتس: مێژوونوس و گەڕیدەیەکی یۆنانی بووە، لەلایەن (شیشرۆن) ەوە، نازناوی (باوکی مێژوو) ی پێدراوە. لەوسەردەمەدا بەهۆی بارودۆخی سیاسییەوە ناچار بووە وڵاتی خۆی بەجێ بهێڵێت. ئەو کاتە لەتەمەنی لاویدا زۆر لە وڵاتان گەڕاوە، چووەتە ناوچەکانی سەرزەمینی سەرووی کەنارەکانی دەریای ڕەش و ناوچەکانی (ئاسیای بچوك، فینیقییە، میسر، بابل، ماد و پارس). دوای ئەوگەشتە دوور و درێژەی چووە بۆ وڵاتی (مەکەدۆنیە). ناوبراو لەوگەشت و سەردانانەیدا چەند نوسینێکی لەبارەی مێژوو، نەریت، ڕەوشت، هەستان و دانیشتنی نەتەوەی ئەو وڵات و ناوچانە نوسیووە، ئەوەی ئەو لە مێژوودا باسیکردووە گرنگترین سەرچاوەیە بۆ زانینی باس و هەواڵی نەتەوە دێرینەکان. دواتر هیرۆدۆت لە دەوروبەری ساڵی (٤٢٥پ.ز) لە خوارووی ئیتالیا کۆچی دوایکردووە.

٦. **موغەکان**: ئەوانە کۆچەری بوون، گەرمیان و کوێستانیانکردووە، بە هەموو ناوچەکانی سەرزەمینی وڵاتی ماددا بڵاوبوونەتەوە، کەسانی ئایینی و باوەڕدار بوون، لەسەرانسەری وڵاتی ماددا (موبیدەکان)[1] لە ئەوان بوون. ئەرکیان ئامۆژگاریکردنی خەڵک بووە بۆ ئایینی ئەوکاتە.

## باری کۆمەڵایەتی و ژیانی مادەکان

هەندێک لە هۆزەکانی ماد، بەکاری ئاژەڵداری، پەروەردەکردنی هەنگ، کاری کشتوکاڵکردن، ناشتنی داری بەردار و دانەوێڵە کردنەوە خەریک بوون، ئەو کاتە جۆرێک لە گەنم، لە وڵاتی ماددا کراوە، پێیی گوتراوە (مینیت). دانیشتوانی بەشێک لە ناوچەکانی خۆرهەڵاتیش بەناشتنی (خەشخاش)ەوە خەریکبوون، بەشێکی تریشیان بەتایبەت ئەوانەی دانیشتووی سەرزەمینەکانی ئێستای تاران و ئیسفەهان بوون، بە پەروەردەکردنی ئەسپ و ماین و سوارچاکییەوە خەریکبوون، کە ئەو کاتە بە ئەسپییان گوتووە (ئەسەری ئەلی)، بە ماینیش گوتراوە (ئەسپاکۆ). ئەو کاتە مادەکان وێنجەیان بە سەرەکیترین ئالیک بۆ ئاژەڵەکانیان بەکارهێناوە، کە پێیانگوتووە (ئەسپەست). ئەو ئەسپانەی کە لەسەرزەمینی ماددا پەروەردەکراون، لەوکاتەدا، زۆر بەناوبانگ بوون، هەر بۆیە ئاشوورییەکان لە بری باج، تەنها ئەسپییان لە مادەکان وەرگرتووە.

ئەوکاتە لەوسنورەدا، گشت ئەندامانی هۆزەکانی ماد، بەشێوەیەکی گشتی خەریکی ئاژەڵداری بوون، بەتایبەت بەخێوکردنی ئاژەڵی گەورەی شاخدار و مەڕ و بزن، هەروەها شارەزاییەکی باشیشیان لە کشتوکاڵکردن و ئاودێریدا هەبووە. ئەوکاتە

[1]. موبید: لە ئایینی زەردەشتیدا، وەکو کاهینەکانی سەردەمی فیرعەونەکان، لە میسر کاروباری ئایینیان بەڕێوەبردوە، وەکو مەلای ئایینی ئیسلام و قەشەی ئایینی مەسیحی ئێستا. (نووسەر)

کەڵکێکی باشیشیان لە نەوت وەرگرتووە، کە لەو خاکەدا هەبووە، پێیانگوتووە (ڕۆنی مادی). لەناو مادەکاندا، چینێکی تریش بەناوی (هوئیتی) هەبووە، کە خولیای هونەر و پیشەسازییە جۆراوجۆرەکان بوون، بەتایبەت دروستکردنی کەرەسەکانی کشتوکاڵکردن و چەکسازی، لەئەنجامی گەڕان و پشکنیندا، لەو ناوچانەی کە پێشتر جێگای مادەکان بووە بەجێماوەکان ڕادەی توانایی و ئاستی شارەزایی ئەوانیان دەرخستووە.

لە سەدەی هەشتەمی پێش زایین، باری کۆمەڵایەتی ئەوان لەو سەرزەمینانەدا، لە ناوچەی بچوک بچوک، کە هەریەکەیان سەرۆکێکی هەبووە، پێکهاتووە، لە کاتی شەڕ و ئاژاوەشدا، لەشکر کۆکردنەوە لەناو هۆزەکانی مادا پێکهاتووە، زوربەی سەرکردەکانی لەشکر سەرۆکی هۆزەکان بوون.

دەربارەی پێکهێنانی هاوسەرگیری، ئەو کاتە مارەکردن نەبووە، بەڵکو ڕازی بوونی کوڕو کچ و باوک و سەرۆک هۆز، مەرجی سەرەکی هاوسەرگیری بووە. هەروەها چەند ژنێک بۆ پیاو لەناو مادەکاندا باو بووە، خیانەتی هاوسەری زۆر شورەیی بووە، ئەو کاتە ژنەکان هاوکاری پیاوەکانییان کردووە، لە کار و ئیشکردندا. خواردن و کەرەسەی ژیانیشیان، لەدارستان و داری بەردار و ئاژەڵ پەیداکردووە.

سامان و دەرامەتیان بریتیی بووە لە (مانگا، گا، بزن، مەڕ و ئەسپ) و ئەو گیاندارانەی، کە بژێوی ژیانی مروڤ پەیدادەکەن. هەر ڕووداوێکیش ڕووی بدایە لە نێوان خێزان یان چەند خێزانێک یان تیرە و هۆزێک لەگەڵ ئەویتردا، هەوڵیانداوە لە ڕێگەی ڕاوێژ و پرسکردن بەڕیش سپیانەوە، کێشەکە یەکلایی بکەنەوە.

پەیوەندیکردن بە فەرمانڕەواو دەسەڵاتدارانەوە، لەڕێگای سەرۆک هۆزەکانەوە بووە، هەر سەرۆک هۆزێک هۆیەک بووە، بۆ پەیوەندیکردن لە نێوان دەوڵەت و هۆزەکەی خۆیدا. وەک کۆکردنەوەی سوپا، باج، چارەسەرکردنی کێشەی هۆزەکە و کاروباری ناوخۆیی، پارە لە نێوانیاندا بەکارنەهاتووە، هەموو کڕین و فرۆشتنێک، لە ڕێگەی ئاڵوگۆڕەوە بووە، واتا کەلوپەل بە کەلوپەلی تر، ئاژەڵیانداوە بە گەنم و جۆ،

گەنم و جۆیانداوە بە هەندێک کاڵاو پێویستی تری ڕۆژانە و ساڵانەیان[1]. بەهۆی میوانداریی‌یەوە، لە خواردنی یەکترییان خواردووە، میوانداری و ڕێزلێنانی میوان لەلای مادەکان زۆر باو بووە. ئەو هۆزانە هەر چەندە لە یەکتر دوور و بڵاوبوون، بەڵام لەکاتی تەنگانە و پێویستیدا، یارمەتی یەکتریانداوە.

دەربارەی جلوبەرگ و پۆشاکی سەردەمی مادەکانیش، پۆشاکەکانییان لە کەتان، پەمۆ، خوری و چەرمی ئاژەڵی ماڵی و کێوی بووە، کە زۆر سادە دروستیانکردووە، وەک فەرەنجییەکی چەرمی قۆڵدرێژ، کە گەیشتۆتە سەر ئەژنۆیان، کەمەربەندێکی دوولا بەقولابیشیان بەستووە، لەسەر جلوبەرگەکانیان، لەگەڵ شەرواڵێکی چەرمی، هەروەها کڵاوێکی لە خوری دروستکراویشیان لەسەرکردووە، کە پشتملی داپۆشیون. مادەکان لە چەرمێکی نەرم پێڵاو و پاپوچی قەیتانداری لوت بەرزیان دروستکردووە.

سەبارەت بە ئایین و بیروباوەڕیشیان، کاروباری ئایینی تەنها لە ئەستۆی گەورە ماڵدابووە، ئەندامانی تری ماڵ خۆیان لە پەرستن و کاروباری ئایینی نەگەیاندوە. مادەکان ئەو کاتە خوای (میترا)[2] یان پەرستووە، کە خوای خۆری مادەکان بووە. هەروەها هەیکەلی داتاشراوی گای باڵدار (ئەبولهەول)یشیان پەرستووە، کە لەلایەن مادەکانەوە دروستکراوە. مادەکان لەسەر ئەو بیروباوەڕەیان بەردەوام بوون، هەتا هاتنی ئایینی (مەزدیسنا)ی (زەردەشت)ی، دواتر بەشێکیان بڕوایان بە (زەردەشت) پەیامبەر هێناوە، کە دواتر و لە بەشی دووەمدا، بەدرێژی باسی ئەو ئایینە دەکەین.

جۆری چەکەکانیشیان پێکهاتووە لە (شمشێر، گورز، کەمەند، ڕم، خەنجەر، تیروکەوان، قەمە، کوتەک و بەردەقانێ). سەرەتا مادەکان بۆ شەڕەکانیان کەڵکیان

---

١. ئەونەریتە تائێستاش لەناو زوربەی گوندەکانی کوردستاندا پەیڕەو دەکرێت. (نووسەر).

٢. میترا: خوای خۆشەویستی و ڕەحمەت و میهرەبانی زەوییە، هەروەها خواوەندی ڕوناکیشە، لە لایەن ئارییە کۆنەکانەوە پەرستراوە. میترا لە ئاڤێستای زەردەشتدا باسکراوە، کە خوایەکی ئەفسانەیی بووە و (١٠٠٠) هەزار گوێ و (١٠٠٠٠) هەزار چاوی هەبووە.

له نێزه و قه‌ڵغانی چوارگۆشه و بازنه‌یی وه‌رگرتووه، که له ئاشوورییه‌کانه‌وه فێربوون، به‌ڵام دواتر تیروکه‌وان و شمشێر جێگای نێزه درێژه‌کانی ئه‌وانی گرتۆته‌وه. شمشێری ماده‌کان که‌مێک له خه‌نجه‌ره‌کانیان گه‌وره‌تر بووه، تیروکه‌وانداره‌کانیش که‌وانه‌کانیان له‌سندوقێکدا داناوه، به‌شانیان یان که‌مه‌ربه‌ندیانه‌وه به‌ستوویانه‌ته‌وه، که‌وانی تیره‌کانیان چه‌ماوه و کورت بووه، وه‌ک ئاشوورییه‌کان له‌پشت سه‌ریانه‌وه هه‌ڵیانواسیوه یان به پشتیانه‌وه به‌ستویانه، به‌ڕێکی له‌سه‌ره‌وه بۆ خواره‌وه شۆڕیانکردۆته‌وه. تیره‌کانیشیان له کیفی چه‌رمیندا پاراستووه، به‌شانیان یان که‌مه‌ربه‌ندیانه‌وه به‌ستوویانه. له کاتی شه‌ڕیشدا، کراسێکی کانزاییان کردۆته‌به‌ریان، که له شێوه‌ی پوله‌که‌ی ماسیدا بووه، تیر , شمشێرو خه‌نجه‌ر نه‌یبڕیووه.

ڕیش و پرچ چنیین له‌ناو ماده‌کان بره‌وی زۆری پێدراوه، نووسینیشیان به‌شێوه‌ی خه‌تی (بزماری) بووه و به‌زمانی پارسی کۆن قسه‌یانکردووه، ماده‌کان و پارسه‌کان زمانیان له‌یه‌ک نزیک بووه و به‌ئاسانی له زمانی یه‌کتر گه‌یشتوون.

## شەڕو پەلاماری (ئاشوورییەکان)[1]، بۆ سەر زەمینەکانی وڵاتی ماد

**هیرۆدۆت نووسیویەتی، مادەکان پێش دروستکردنی دەوڵەت، بە شێوەیەکی پچڕپچڕ، ماوەی (٥٠٠) پێنج سەد ساڵ، واتا نیوەی یەک هەزارە، لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی ئاشوورییەکاندا بوون. بە بۆچوونی هیرۆدۆت، ئەو نەتەوەیەی کە لەپێش نەتەوەکانی تردا، لە کۆت و زنجیری ئاشوورییەکان ڕزگاری بووە، مادەکان بوون. لە نووسراوە بەردینەکانی ئاشووریی، لە بارەی ژێردەستەبوونی مادەکان، لەلایەن ئاشوورییەکانەوە، بەو جۆرەی خوارەوە ئاماژەی پێکراوە:**

**(تیگلات پیلیساری یەکەم١١١٥ -١٠٧٧پ.ز) لە لای خۆرهەڵاتی وڵاتەکەی،**

١. ئیمپراتۆریەتی ئاشووریی (٢٣٥٨ - ٦١٢پ.ز): یەکێکە لە دیارترین و بە ناوبانگترین ئیمپراتۆریەتەکانی ناوچەی دۆڵی نێوان دوو ڕووبار واتا (میسۆپۆتامیا) لە سەدەکانی پێش زایینیدا. سەرەتا ئاشوورییەکان لەنیوەی دووەمی هەزارەی سێیەمی پێش زایین وەك میرنشین دەرکەوتوون، دواتر دەوڵەتێکی بەهێز و فراوانییان لەناوچەکانی دەورووبەری شاری موسڵی ئێستای ئێراق دامەزراندوە. دەوڵەتی ئاشوور بەچەند خولێکدا تێپەڕ بووە. کە تەنها لەخولی یەکەمدا ناوی (٣٠) سی پاشایان هاتووە. سەبارەت بە ناوەکەش، ئەوەی کە تاکو ئێستا زانراییت (ئاشوور) ناوێك کە بەدامەزرێنەری دەوڵەتی ئاشوور دادەنرێت. لە ساڵی (٢٣٥٨پ.ز) لە کەنارەکانی ڕووباری دیجلە و لە نزیك شاری موسڵی ئێستا شارێکی دروستکردوە بەناوی خۆیەوە، کە ئەوپیاوە لە نەوەی (ئاشووری کوڕی سامی کوڕی نوح) پەیامبەر بووە. بەڵام هەندێك سەرچاوەی تر دەڵێن (ئاشوور) یاخود (ئاڵاشکار) ناوی خوای (رب النوع) ی ئەو شارە بووە و هەر بەوهۆیەشەوە شارەکە ناونراوە ئاشوور. بەپێیی سەرچاوە بەجێماوەکانی ئاشوورییەکان، دواتر پاشایەکی تری ئاشووریی بەناوی (نینەی کوڕی بلوز) یان (نینەی کوڕی شمشۆ ئایلۆنای کوڕی حاموڕابی) پاشای بابل کە ساڵی (٢٠١٨پ.ز) فەرمانڕەوای وڵاتی ئاشوور و کلدە بووە. شاری ئاشووری گواستۆتەوە و شارێکی تازەتری دروستکردوە. ئەوکاتە نەتەوەکانی تر بەو شارەیان گوتووە (نین ئاوا)، لە ئەنجامدا شارەکە بە (نەینەوا) ناوزەدکردوە. ئەوشارە دەکەوێتە سەر ڕووباری دیجلە لە ڕۆژئاوای شاری موسڵی ئێستا، کە لە دوو گردپێکهاتووە ئەوانیش گردی (قونیجوف) و گردی (یونس) پەیامبەرن. ئەوکاتە ئەوشارە بە شورا و دیواری پتەو دەوردراوە. ئاشوورییەکان لەسەردەمی فەرمانڕەواییاندا چەندین دەوڵەت و شارستانییان لەناوچەکانی دەورووبەری خۆیاندا لەناو بردوە، لەوانە شارستانییەتی (لۆلۆییەکان، میتانییەکان و ئیلامییەکان). ئاشوورییەکان بە دڕندیی و خوێنڕێژی دەناسرێنەوە لە مێژوودا. کە لە هێرشەکانیاندا چەندین سەرکردە و پاشای دوژمنەکانیان بەزیندویی پێستکەندکردوە. یان نینۆك و چاویان دەرهێناون و گوێ و لوتیان بڕیون. یاخود بەزیندویی و بە بەرچاوی خۆیانەوە کوڕ و کچی دوژمنەکانیان خستونەتە ناو ئاگرەوە. لە شوێنەوارە بەجێماوەکانی ئەوان ئەوەی کە تاکو ئێستا مابێتەوە شوێنەواری (خنس)ە لە ناوچەی قەزای (شێخان) ی باکووری خۆرئاوای شاری موسڵ. هەروەها ئاشوورییەکان زۆر پەرەیان بە دروستکردنی قەڵا داوە. گلیان بە دیلە جەنگییەکانیان کۆکردۆتەوە و کۆشك و قوللە و سەنگەرییان لەسەر ئەو قەڵایانەدا دروستکردوە. جێگای باسە کە زوربەی قەڵا گلەکانی ئێستای کوردستان لە پاشماوە و بەجێماوی ئەوانن.

هێرشیکردووه بۆ چەند ناوچەیەک، کە دواتر بەپێیی جوگرافیای مێژوویی، بەشێک بووه لە سنووری وڵاتی مادەکان، ئەوکاتە تیگلات پیلیسار، لە زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس تێپەڕیکردووه، لەو یاداشتەدا هاتووه، کە تیگلات پیلیساری یەکەم هەتا باشووری دەریاچەی چیچێست پێشڕەویکردووه، دوای ئەوەی خەڵکێکی زۆری خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، دواتر ئەو ناوچانەی کردووه بە بەشێک لەو (٤٢) چل و دوو نەتەوەیەی، کە باجیان بە تیگلات داوه. ئەوانیش ئاژەڵ و دانەوێڵەیان وەک باج پێشکەش بە تیگلات پیلیسار کردووه.

هەریەکە لە (ئادادنیراری دووەم ٩١١ - ٨٩١ پ. ز) و کوڕەکەی (توکولتی نینۆرتای دووەم ٨٩٠ - ٨٨٥ پ. ز)، دوای ئەویش کوڕەکەی واتا، (ئاشوور ناسرپاڵی دووەم ٨٨٥- ٨٥٩ پ. ز)، هەموویان بەبێ جیاوازی لەسەردەمی خۆیاندا هێرش و لەشکریان کردۆتە سەر وڵاتی مادەکان.

(شەلمانسەری سێیەم ٨٥٨- ٨٢٤ پ. ز)، کوڕی ئاشوور ناسرپاڵی پاشای پێشوو



ئاشوور ناسرپاڵی دووەم

تری ئاشوورییەکان بووە، لە ساڵی (٨٣٦ پ.ز)، بەمەبەستی هێرشکردن، ڕوویکردۆتە ناوچەکانی دەورووبەری دەریاچەی چیچێست، مەبەستی شەلمانسەر لەو هێرش و لەشکرکێشییەدا داگیرکردن و وێرانکردنی دەوڵەتی ئەو کاتەی (ماننایییەکان)[1] بووە. بەسەرزەمینی مادەکاندا تێپەڕیووە و ئەو ناوچانەی داگیرکردووە، لەساڵنامەی شەڕەکانی شەلمانسەردا، کە لە ساڵی (٨٣٥ پ.ز) نووسراوە، لەو یاداشتەدا بەتایبەت بۆ سەرزەمینەکانی (ئامادای و پارسوماش) ئاماژەیکردووە. دەردەکەوێت، کە ئەو کاتە نزیکەی (٢٧) بیست و حەوت فەرمانڕەوا، کە بەسەر بیست و حەوت ناوچەی جیاجیای ئەو وڵاتەدا فەرمانڕەواییانکردووە، کردونییە ژێردەستەی خۆی و باجی لێوەرگرتوون. دوای ئەویش کوڕەکەی بەناوی (شەمشی ئەدەدی پێنجەم ٨٢٤ - ٨١٠ پ.ز)، کاتێک بووە بەفەرمانڕەوایی ئاشوورییەکان، ئەویش بەهەمان شێوە و بەو مەبەستەی، کە فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتی ئاشوورییەکان لەو ناوچانەدا بچەسپێنێت، لەشکرکێشی و داگیرکاری بۆ ناوچەکانی خۆرهەڵاتی ئاشوور تازەکردۆتەوە. یەکێک لە هۆیەکانی ئەو لەشکرکێشییەی شەمشی ئەدەد، ڕووبەڕووبوونەوە بووە لەگەڵ (ئورارتوویییەکان)[2] و ماننایییەکان، کە لە درێژەی

١. ماننایییەکان: ئەو دەوڵەتە پێش مادەکان لەنێوان ساڵانی (٨٣٠-٦٦٠پ.ز) لە دەورووبەری دەریاچەی چیچێست هەبووە. ئەوانیش یەکێکن لە باپیرە و پێکهاتەی کوردەکانی ئێستا.

٢. ئورارتوویییەکان یان نارارانییەکان: لە سەرچاوە مێژوویییەکاندا بە (خالدی) ش ناودەبرێن، ئەو ناوەش لە ناوی خواوەندێکی سەرەکیانەوە وەرگیراوە کە ناوەندی پەرستنی لە (موساسیر) نزیک ڕەواندزی ئێستا بووە. ئورارتوویییەکان لە دەورووپشتی دەریاچەی (تەرجیش) وانی ئێستا و وڵاتی ئەرمینیای ئێستا لە سەدەی هەشتەمی پێش زایین وەکو دەوڵەتێکی هاوشانی ئاشوورییەکان دەرکەوتوون. (توشپە) شاری وانی ئێستا لە باکووری کوردستان پایتەخت و شوێنی بڕیاردانی دەوڵەتەکەیان بوو. لە پاشا بەناوبانگ و دیارەکانی ئورارتوویییەکان (مینواس) ی کوڕی پاشا (تیشپونی) یە کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەودا وڵاتی ئورارتوو زیاتر بەرەو گەشانەوەو پێشکەوتن چووە. مینواس شارێکی بەناوی (مینواس کرد) واتا دەستکردی مینواس دروستکردوە کە ئەو شارە ئێستا بە (مەلازکرد) ناودەبرێت و دەکەوێتە باکووری دەریاچەی وان لە باکووری کوردستان. ئەو پاشا بەناوبانگە تائێستاش پاشماوە و جێدەستی ماوە، یەکێك لە دیارترین بەجێماوەکانی نووسینەکەی (کێلەشین) ە، ئەو بەردە نووسراوە لە دەربەندی کێلەشین کە دەکەوێتە نێوان شارەکانی شنۆ و ڕەواندز لە شاخەکانی کوێستانی سورچیایەتی. ئەو نووسراوە بەشێوە نووسینی بزماری و بەزمانی خالدی کە زمانی دەوڵەتی ئورارتوویییەکان بووە نووسراوە. مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (٨١٠پ.ز).

ئەو داگیرکارییانەدا، ساڵی (٨٢٠ پ.ن) هێرشێکی وێرانکەر و گەورەی کرۆتە سەر مانناییەکان، ئاشوورییەکان لەو هێرشەیاندا ڕویانکردۆتە کوێستانی (گزیل بووندا)، کە ئەو ناوچەیە سەرزەمینی مادی لە ناوچەی مانناییەکان، لە دەوروبەری دەریاچەی چیچێست جیاکردۆتەوە، دوای ئەوەی ئاشوورییەکان یەکەمین قەڵای کوێستانی ناوچەی ناوبراویان داگیرکردووە، لەو شەڕدا، پێشەوایەکی ناوچەکە، کە لە یاداشت و پاشماوەی ئاشوورییەکاندا، بە پێشەوای گزیل بووندا ناسراوە، بەناوی (پیریشاتی)، بەرگرییەکی بێوێنەی لە ناوچەکەی کردووە و ویستوویەتی لەبەرامبەر ئاشوورییەکاندا شەڕبکات، بۆ ئەو مەبەستە، هەموو دانیشتوانی ناوچەی گزیل بووندا چوونەتە ناو قەڵای (ئوراش)، بەڵام لەبەر کۆنی قەڵاکە لەلایەک و بەهێزی لەشکری ئاشوورییەکان، کە لەوکاتەدا، بەهەموو جۆرە چەکێکی کاریگەری ئەو سەردەمە پڕچەک بوون، ئوراش و قەڵا بچوکەکانی تری دەوروبەری کەوتونەتە ژێردەسەڵاتی ئاشوورییەکانەوە. بەپێیی ئەو یاداشتە لەو شەڕەدا (٦٠٠٠)[1] شەش هەزار شەڕکەر کوژراون و (١٢٠٠) هەزار و دوو سەد کەسیش بەچەکەکانی خۆیانەوە لەگەڵ پیریشاتی سەرکردەیان بە دیلگیراون، ژمارەیەکی زۆریش ئاژەڵی شاخداری گەورە و بچوک و گوێدرێژ و ئەسپ و کۆمەڵێکی زۆر وشتری دووکۆپانی باکتریا، کە تازە لەخاکی ماددا پەیدا بووە، بە تاڵان بۆ وڵاتی ئاشوور بردویانن. دواتر پێشەوایەکی تری مادەکان کە ناوی (هاناسیروکا) بووە، لە قەڵای (ساگ بیتو) دانیشتووە، ویستوویەتی لە ترسی ئاشوورییەکان لە شاخە بەفرینەکانی ئەلبورزدا خۆی بشارێتەوە، بەڵام شەمشی ئەدەد هێرشی کردۆتە سەریان و ئەوانیشی ناچاری شەڕکردن کردووە، لە ئەنجامدا مادەکان توشی شکستێکی باش بوون، بەپێیی ئەو یاداشتەی کە باسی ئەو شەڕ و هێرشە دەکات، ئاشوورییەکان زیانێکی زۆریان بە مادەکان گەیاندوە،

١. ئەو ژمارەیە و چەندین ژمارەی تر لە کاتی تۆمارکردنیاندا زیادەڕۆییان تێدا کراوە. چونکە زۆربەی پاشاکانی ئاشووریی لە تۆمارکردنی دیل و دەسکەوت و شەڕ و پەلامارەکانیاندا ژمارەکانیان دوو ئەوەندە زیاد کردووە. بەمەبەستی نیشاندانی دەسەڵات و هێز و بەتواناییان لە بەرامبەر نەتەوەکانی تر. (نووسەر).

کە (٢٣٠٠) دوو هەزار و سێ سەد کوژراو و (١٤٠) سەد و چل کەسیشیان بە دیلگیراوە، چەند ناوچەیەکی نیشتەجێبوونیش لەگەڵ قەڵای ساگ بیتو وێرانکراون. لەکاتێکدا کە ئاشوورییەکان بەشاخەکاندا تێپەڕبوون (مون سوارتا)، کە فەرمانڕەوایەکی تری مادەکان بووە و لە قەڵای (ئارازیا) دانیشتووە دەستیداوەتە بەرگریکردن، چونکە خۆڕاگری مادەکان بەو شەڕانەی پێشتر تێکنەشکاوە، بەڵام لەئەنجامدا مادەکان لەلایەن ئاشوورییەکانەوە لێدانێکی باشیان لێدراوە و لەشکرەکەیان شکێندراوە. بەپێیی ئەو نووسراوەی، کە باسی ئەو شەڕە دەکات (١٠٧٠) هەزار و حەفتا کەس کوژراون، ژمارەیەکی زۆریشیان لێ بە دیلگیراوە و کۆمەڵێکی زۆر ئاژەڵ و مەڕ و ماڵاتیشیان بەتاڵان بردووە. جێگای باسە هۆزەکانی ماد هەرگیز بەوجۆرە توشی شکست و سەرلێشێوان نەبوون، چونکە ئەو کاتە لە دەوروبەری ناوچەکانی خۆرئاوای مادەکان سەرۆک هۆزەکانی ماد یەکێتییەکی پتەویان نەبووە، بەهۆی بوونی بیروڕای جۆراوجۆر و سیاسەتی جیاوازەوە، بەڵام لە کاتی تەنگانە و ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمندا تەواوی خەڵکەکە یەکیانگرتووە و هاوکاری یەکیان کردووە. دوای ئەو شەڕ و هێرشانە پێشەوایەکی تری ناوچەی گزیل




**شەڕ و پەلاماری ئاشوورییەکان بۆسەر زەمینەکانی وڵاتی ماد**

بووندا، بەناوی (ئینگور) ملکەچی پاشای ئاشوور بووە، بەمەبەستی هاوپەیمانێتی و دۆستایەتی لەگەڵ ئاشوورییەکان، کۆمەڵێک ئەسپ و عەرەبانەی بەناوی دیارییەوە پێشکەش کردووە، شەمشی ئەدەدیش وێنەی خۆی و ئینگور و نووسراوێکی بۆ یادگاری، لەسەر بەردێک هەڵکەندوە و لە قەڵای (سیبار) دایناوە. دوای مردنی شەمشی ئەدەدی پێنجەم لە ساڵی (٨١٠ پ. ز).

(ئەدادنیراری سێیەم ٨١٠ - ٧٨٣ پ. ز) کوڕی شەمشی ئەدەد، کە لەو کاتەدا، منداڵ بووە، بووەتە جێنشینی باوکی و چووەتە سەرتەختی فەرمانڕەوایی ئاشوورییەکان، بەڵام شاژنە (سامورامات)ی دایکی، کە لە مێژوودا بە (سەمێرامیس) ناسراوە، بۆ ماوەی (٤) چوار ساڵ، واتا لە ساڵی (٨١٠ - ٨٠٦ پ.ز) لەبری کوڕەکەی وڵاتەکەی بەڕێوەبردووە. ئەوانیش لەسەردەمی فەرمانڕەوایی خۆیاندا پێنج جار هێرشیانکردۆتە سەر وڵاتی ماد.

بەهەمان شێوەش (تیگلات پیلیساری سێیەم ٧٤٥ - ٧٣٠پ.ز)، کاتێک کە بووە بەپاشای ئاشوور، زنجیرەی دووەمی پاشایانی ئاشووریی دامەزراندوە، ساڵی (٧٤٤پ.ز)، بە سەرکردایەتی (ئاشووردانی نانی)، کە ئەوکاتە فەرماندەی لەشکری



**تیگلات پیلیساری سێیەم**




ئاشوورییەکان بووە، پەلاماری مادەکانی داوە. تیگلات پیلیساری سێیەم لە یاداشتەکانیدا باسدەکات، کە لەو هێرشەیدا، بۆ سەر مادەکان گەیشتۆتە شاخی دەماوەند، دوای داگیرکردنی ئەو ناوچانە و شکستدانی دانیشتوانەکەی، (٦٥٠٠٠) شەست و پێنج هەزار کەسی لە مادەکان بە دیلگرتووە، دەسکەوتێکی زۆری چەک و (گا، مەڕ، بزن، وشتر، هێستر و ئەسپ)ی بە تالآن بردووە. گیراوەکانیشیان لە ناوچەیەکی دەوروبەری ڕووباری سیروانی ئێستا نیشتەجێکردووە، هەروەها (١٨٠٠٠) هەژدە هەزار کەسیشی لە دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ئەو ناوچەیە، بەرەو وڵاتی سوریا ڕاگواستووە، کە ئەو کاتە ئەو ناوچانە بەشێک بوون لە وڵاتی ئاشوورییەکان. تیگلات پیلیسار جگە لەو شەست و پێنج هەزار کەسە، کە لە مادەکان بەدیل گرتوونی (٢٠٠٠٠) بیست هەزار ئاوارەی تریشی لە وڵاتی سوریاوە هێناوە، بۆ ناوچەی شاخەکانی زاگرۆس.

لەسەردەمی (سارگۆنی دووەم ٧٢٢ - ٧٠٥پ.ز) ئەویش بەهەمان شێوەی فەرمانڕەوایانی پێشتری ئاشووریی، ساڵی (٧٢٢پ.ز) بەمەبەستی پەرەپێدانی قەڵەمڕەوییەکەی، لە سەر خاکی ماد و کەڵک وەرگرتن لە کانە ئاسنەکانی ئەو

وڵاتە و ڕووەکە دەرمانییەکانی ناوچەکە هەڵیکوتاوەتە سەرزەمینی ماد، سەرەتا نەخۆشخانەی بەناوبانگی (ئالان)[1]ی خاپوور و وێرانکردووە. لەو پەلامارانەدا، زوربەی زۆری دانیشتوانی ناوچەکانی مادی بە دیلگرتووە، بەرەو نەینەوای پایتەختی وڵاتی ئاشوور بردونی، لە شوێنی ئەوانیش (٤٠٠٠٠) چل هەزار جولەکەی (سامارات)، کە لە داگیرکردنی شاری (سامرە)، لە وڵاتی فەلەستین بە دیل گرتبوونی، بەرەو شارەکانی (بابل و نەینەوا) و شارەکانی تری مادی وەک،

(پادمان، سازان، ئالان، موکریان، کەلهور، حەلوان و کارنا) ڕایگواستوون و لەجێگەی دورخراوەکانی ماد نیشتەجێیکردون. بەپێیی سەرچاوە بەجێماوەکانی ئاشوورییەکان، ئەو کاتە لەسەرەتای سەدەی حەوتەمی پێش زاییندا، (٥) پێنج ویلایەتی ئاشوورییەکان لە سەرزەمین و وڵاتی ماددا هەبوون.

هەر لە درێژەی لەشکرکێشیی و داگیرکاریی ئاشوورییەکان، بۆ سەر ناوچەکە، دوای ئەوەی (ئیرانزۆ)ی پاشایماننایییەکان، ساڵی (٧١٦پ.ز) کۆچی دوایی کردووە، لەو ساڵەدا، (ئازا)ی کوڕی بووەتە جێنشینیی باوکی.

(ماتات)ی فەرمانڕەوای (زیکورتو) و (ئەنلوسینا)ی فەرمانڕەوای (ئاندیا) و (بگداتو)ی فەرمانڕەوای (ئوئیشدیش)، کەئەوانیش وەکو (دیاکۆ) لەلایەن پاشای مانناییەکانەوە، بە فەرمانڕەوای ناوچە جیاجیاکانی ئەو وڵاتە دانراون، لە دژی ئازا ڕاپەڕیوون، ئازایان بەوە تاوانبار کردووە، کە لەگەڵ سارگۆنی پاشای ئاشوورییەکاندا، پەیمانی بەستووە. لەئەنجامدا، ئازایان گرتووە و کوشتویانە، دواتر تەرمەکەیان لە شاخی (ئاوائوش) فڕێداوە، سارگۆنیش لە تۆڵەی ئەوکارەیان، دەمودەست پەلاماریداون و باگداتوی دەسگیرکردووە و فەرمانیداوە پێستەکەیان گروپوە و لە پێشانگای سەیرکردنی مانناییەکاندا هەڵیانواسیوە. دواتر سارگۆن کوڕێکی تری

١. ئالان: ناوچەیەکە دەکەوێتە سەرسنوور لە خۆرهەڵاتی کوردستان، نزیك لە ناوچەکانی شارباژێڕ و پشدەر لە باشووری کوردستان، ئەوکاتە ئەو شوێنە نەخۆشخانەیەکی گەورە و بەناوبانگی لێبووە کە پزیشکێك بەناوی (نەمری) لەو نەخۆشخانەیەدا کاریکردوە و لە ڕووەکەکانی ناوچەکە دەرمانی دژە ژەهری مار (تریاك) ی دروستکردوە، دواتر ئەو دەرمانەی بۆ وڵاتانی ئاشوور و ڕۆم و یۆنان ناردوە بەناوی (سارپێژ) ەوە.

ئیرانزۆ، کە ناوی (ئولوسونو) بووە، لەسەر تەختی پاشایی مانناییەکان دایناوە. لەگەڵ ئەوەشدا، کە ئولوسونو سەرانسەری وڵاتەکەی بە لەشکری ئاشوورییەکان گیراوە، بەڵام هەر زوو لە ئاشوورییەکان جیابۆتەوە، لەگەڵ (ڕوسای یەکەم)ی پاشای ئورارتوویيەکان، پەیمانی بەستووە، (٢٢) بیست و دوو قەڵای ئاوەدانی ناوچەکەی بە دەستەوەداوە، کە لەلایەن ئاشوورییەکانەوە داگیرکرابوون، لەژێر فەرمان و دەسەڵاتی ئاشوورییەکاندا بوون. لەبەرامبەری ئەو کارەی ئولوسونودا، سارگۆن نەگەڕاوەتەوە بۆ پایتەختی ئاشوور، هەتا (ئیزیرتو)ی پایتەختی مانناییەکان و دوو قەڵای گرنگی ناوچەکەی بەناوی (زیبییە و ئاماریت) ی داگیر و وێراننەکردووە. دواتر ئولوسونو خۆی ڕادەستی پاشای ئاشوور کردۆتەوە، ئەویش لە بری هاوکاریکردنیدا، لێیی خۆشبووە و پاشایەتی وڵاتی پێداوەتەوە، بەڵام لەئەنجامی ئەوکارەدا، ڕوسای پاشای ئورارتوو، لەدژی ئولوسونوی فەرمانڕەوای مانناییەکان، دەستی بەشەڕکردن کردووە، چونکە بوەتە لایەنگر و هاوپەیمانی پاشای ئاشوور. بەو مەبەستە دیاکۆی ڕاسپاردوە، کە لە دەوڵەتی مانناییەکان جیاببێتەوە. دواجار ئاشوورییەکان ساڵی (٧١٥پ.ز)، لە دژی دیاکۆ لەشکریانکردووە، کە ئەو کاتە



**دیاری و باج وەرگرتن**

بەشێکی زۆری سەرزەمینی وڵاتی ماننابیەکان، لەلایەن دیاکۆوە فەرمانڕەوایی کراوە. لەئەنجامی ئەو شەڕ و هێرشانەدا، ئاشوورییەکان دیاکۆیان دەسگیرکردووە و لەگەڵ ئەندامانی بنەماڵەکەی بەدیلی دوریانخستۆتەوە، بۆ شاری (حمات)، لە وڵاتی سوریای ئێستا. لە نوسینەکانی سارگۆندا، کە بە مەبەستی لەشکر کێشییەکانی ساڵانی (٧١٤ - ٧١٣پ.ز) نووسراون، لە کاتی لەشکرکێشی بۆسەر ناوچەکانی خۆرهەڵاتی ماد، سێ دەسەڵاتداری خاوەن ئاوایی مادە دوورە دەستەکان بە ناوەکانی (ئوپیس) فەرمانڕەوای (پارتاکی)، (زاناسان) دەسەڵاتداری (پارتوکی)، (ڕامان) ی فەرمانڕەوای (ئوراکازابارنا)، ملکەچی و دۆستایەتی خۆیان بۆ پاشای ئاشوور ڕاگەیاندوە، داوای یارمەتیان لێکردووە، بەو مەبەستە دیاری و بەردی لاجیوەرد و ئەسپی ڕەسەنیان بۆ پاشا ناردوە.

دواتر (ئەسەرهەدوون ٦٨١ - ٦٦٩پ.ز)، کوڕی (سەنهاریب ٧٠٥ - ٦٨٣پ.ز) کوڕەزای سارگۆن، لەسەردەمی فەرمانڕەوایی خۆیدا، ڕێککەوتنێکی لەگەڵ ڕامانی میری مادەکان واژۆکردووە، لە ساڵی (٦٧٢پ.ز)، کە دەقی بەجێماوەکەی بەو شێوەیەیە: (ئەوە پەیمانێکە کە ئەسەرهەدوون شای جیهان، پاشای ئاشوور لەگەڵ



ئەسەرهەدوون

راماتایا ئەمیری شاری ئوراکازابارنا دەیبەستێت، ئەوە پەیمانێکە کە ئەسەرهەدوون لەگەڵ تۆدا بە ئامادەبوونی خواگەورەکانی ئاسمان و زەوی، لەبارەی ئاشوور پانیپاڵی جێنشین، کوڕی سەروەری ئەسەرهەدوون، کە وەک جێنشین دانراوە دەبەستێت. کاتێک ئەسەرهەدوون مرد، ئاشوور پانیپاڵ پاشا و فەرمانڕەوای ئاشوور، بەسەرتۆدا کارەکانی دەکات. تۆ دەبێت لە شار و لادێدا، پارێزگاری لەو بکەیت.. تۆ دەبێت، بۆ ئەو بجەنگیت و بمریت، نابێت دوژمنایەتی لەگەڵ ئەودا بکەیت، نابێت دژی ئەو هەستیت یان شتێک لە دژی ئەو لەئەستۆ بگریت، کە شایستە و شیاو نەبێت).

ئاشوورییەکان تەنها بە زۆری چەک و لەشکرکێشی، توانیویانە مەڕ و ماڵات و باج و سەرانە لە مادەکان بستێنن، چونکە لە شەڕەکانیاندا، زیاتر مەبەستییان تالانکردن و بردنی مەڕ و ماڵات و دیل گرتن بووە. لەوکاتانەدا، هەرکاتێک لەشکری ئاشوورییەکان لە ناوچەکانی مادەکان نزیک بۆتەوە، مادەکان لەسەر شاخەکان ئاگریانکردۆتەوە، بەمانای ئەوەی، کە لەشکری ئاشوور هاتووە و نزیک بوەتەوە. ئینجا زوربەی دانیشتوانەکان ئاواییەکانی خۆیان بەجێهێشتووە و ئاژەڵەکانیان لەگەڵ خۆیان بردووە بۆ شاخەکان، ئەو ئاواییانەشی کە شوێنەکەیان سەخت



ئاشوورپانیپاڵ

بووه یان شورایان بەدەوردا کراوە، مەڕ و ماڵاتەکانیان لەوێدا کۆکردۆتەوە، لەگەڵ ئاشوورییەکاندا کەوتوونەتە شەڕەوە. دەتوانین بڵێین، هەموو پاشاکانی ئاشوور، بەبێ جیاوازی لەشکرکێشی و هێرشیانکردووە بۆسەر ناوچەکانی نیشتەجێبووی هۆزەکانی ماد، مادەکانیان بەخەڵکانێکی یاخیبوو و شەڕانی زانیووە. مادەکان بەهۆی چەند یاسایەکی پڕ لە زەبر و زەنگەوە، کە لەلایەن ئاشوورییەکانەوە سەپێنراوە بەسەریاندا، دووچاری سەرکوتکردن بوونەتەوە. دوای گیرانی دیاکۆ و دوورخستنەوەی لەلایەن ئاشوورییەکانەوە، مادەکان وەک ژێردەستە و باجدەری ئاشوورییەکان، ملکەچیان بوون. دوای داگیرکردنی سەرزەمینەکەیان، (٤٥) چل و پێنج کەس لە سەرکردەی هۆزەکانی ماد، بڕوایان بە سارگۆن هێناوە، کە خواوەندیانە و بڕیاریانداوە باجدەری بن.

دواتر (٢٢) بیست و دوو کەس لە گەورە پیاوانی ماد، بۆتکاکردن و داخوازی هۆزەکانی ماد، چوونەتە وڵاتی ئاشوور و لە پایتەخت لەگەڵ سارگۆنی دووەم ڕێککەوتوون، زۆر زیرەکانە توانیویانە سارگۆن ڕازیبکەن، کە دیاکۆ ئازاد بکات، سوێندی وەفادارییان بۆ خواردوە و سەرسپاردن و ملکەچی خۆیان بە پاشای ئاشوور ڕاگەیاندوە. دوای ئەوەی دیاکۆ چەند ساڵێکی وەک دیلێکی شەڕ، لەلایەن سارگۆن و ئاشوورییەکان بەسەر بردووە، ئینجا ئاشوورییەکان دیاکۆیان ئازادکردووە، بەومەرجەی، کە هەمیشە وەک گوێڕایەڵێکی ئاشوورییەکان بمێنێتەوە، هەموو ساڵێک باجی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی، بە ڕێکوپێکی بنێرێت، بۆ پایتەختی ئاشوور، هەروەها لە هەموو شەڕ و نەهامەتییەکیشدا، کە ڕووبەڕووی وڵاتی ئاشوور ببێتەوە، لەشکرو سەربازەکانی بۆ پشتیوانیکردن لە سوپای ئاشوورییەکان بنێرێت.

## سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی ماد

### یەکەم: دیاکۆ (٧٠٠-٦٥٥پ.ز)



دیاکۆ

هیرۆدۆت ئەوی بە (دیوک) ناوبردووە، یۆنانییەکانیش بە (دیوکس) لە مێژوودا ناویانهێناوە. دیاکۆ کوڕی (خشترتیە - فرائورت) بووە، بەپێیی وتەی هیرۆدۆت، دیاکۆ لە هۆزی موغەکان بووە. وەک ئەندامی یەکێک لە و هۆزە، لە ناوچە کوێستانیەکاندا ژیاوە، دیاکۆ بە مرۆڤێکی خۆشەویست و خاوەن ڕێز ناسراوە، دوای گەڕانەوەی دیاکۆ، لەدیلێتی و دوورە وڵاتی، هەموو هۆزەکانی سەرانسەری وڵاتی ماد، لەگەڵ یەکدا کۆبوونەتەوە و کەوتونەتە ڕاوێژکردن، بۆ ئەوەی فەرمانڕەوایەک بۆخۆیان دەستنیشان بکەن، چونکە هەستیان بەوە کردووە، ئەگەر فەرمانڕەوایەکیان نەبێت، ناچاردەبن سەرزەمینەکانی خۆیان، لە ترسی پەلامار و داگیرکارییەکانی لەشکری ئاشوورییەکان بەجێبهێڵن. بۆیە بۆ یەکەمجار، لە ساڵی (٧٠٨پ.ز)، هەمووان بڕیاریانداوە، کە دیاکۆ وەک ڕابەر و ڕیش سپی، لەنێو هۆزەکانی ماد هەڵبژێرن. کارو ئەرکەکانی ئەوکاتەی دیاکۆ، زۆر بەسەخت و دژواری باسکراوە، چونکە زۆرتری ئەو ماوەیەی بۆ یەک پێگرتنی تیرە پەرت و بڵاوەکانی ماد تەرخانکردووە، بەڵام دوای (٧) حەوت ساڵ لەو مێژووە، دیاکۆ لە داخی گوێنەگرتن و لاساری ئەندامە پەرت و بڵاوەکانی هۆزەکانی ماد، بەچەند بەهانەیەک لە لێپرسراویەتیەکەی دەستی هەڵگرتووە. لەئەنجامی وازهێنانی دیاکۆدا، دزی و کاری خراپ لەناو مادەکان زیاتر پەرەی سەندوە، ئاژاوە، پشێوی، دەستدرێژی، گوێنەدان بە یاسا و کوشتار باڵیکێشاوە بەسەر ناوچەکانی ئەو هۆزانەدا. دواتر پیاوماقوڵانی ماد، بەنهێنی ئاشوورییەکانەوە، کە لەوکاتەدا،

(سەنهاریب٧٠٥ - ٦٨٣پ.ز) پاشای ئاشوورییەکان بووە و بەشەڕکردن لەگەڵ (ئیلامییەکان) سەرقاڵ بووە. بڕیاریانداوە، کە دیاکۆ بەوەرگرتنی دەسەڵاتێکی فراوانەوە، واتا بەناوی (پاشا) لەساڵی (٧٠٠پ.ز) دابنێن[1].

هیرۆدۆت ئەوی بە پیاوێکی خاوەن ویژدان و دادپەروەر لەبەرامبەر لێکۆڵینەوەی سکاڵای خەڵکیدا ناوبردووە، چونکە هەرگیز فەرمانی ستەمکارانەی دەرنەکردووە.

دوای ئەوەی دیاکۆ بەفەرمی وەکو پاشای ماد جێگیربووە، داوای لە خەڵکەکەی کردووە، کە کۆشکێکی پاشایەتی بۆ دروستبکەن[2]. دواتر لە دەوروووبەری کۆشکەکەدا، شارێک بۆ نیشتەجێبوونی خۆیان بنیاد بنێن، دیاکۆ لەوکارەیدا، مەبەستی بووە، کە شارەکە بکات بە پایتەختی دەوڵەتی ماد. هیرۆدۆت دەڵێت: (سەرزەوییەک کە ئەو کۆشکەی تێدا دروستکراوە، بریتیی بووە لە گردێک، بۆ ئەوەی کۆشکەکە بەسەر شارەکەدا بڕوانێت و لەهەموولایەکەوە دیاربێت). دواتر (٧) حەوت دیواری بازنەییان بۆ پارێزگاریکردنی کۆشک و قەڵاکان بەدەووری یەکدا دروستکردووە، کە هەر دیوارە، لە ئەوی تر تەنیا بە بەرزی (ژۆنە)[3] یەک بەرز تر بووە. لەنێوان هەر دیوارێکیش، کۆشکێکی گەورەی بۆ سەرۆک هۆزەکانی ماد، تێدا دروستکردووە، لە ناوەڕاستی دوا دیواریش، لەسەر گردۆلکەکە، کۆشکی پاشا و گەنجینەکان، لەسەر ڕووبەری زیاتر لە کیلۆمەترێک دروستکراون. شایانی باسە، کە تەواوی بەشەکانی ئەو

١. کاتێك دیاکۆ ساڵی (٧٠٠پ.ز) وەکو پاشای مادەکان دەستنیشانکراوە، مادەکان لەسەر شاخ و شوێنە بەرزەکاندا ئاگریانکردۆتەوە بۆ ئاگادار کردنەوەی سەرۆك هۆز و دانیشتوانی گوند و ئاواییەکان. بەڕێکەوت ئەو ڕۆژە هاوکات بووە لەگەڵ یەکەم ڕۆژی بەهار. کە ئێستا بووە بە سەری ساڵی کوردی و مێژووە کەی (٧٠٠) حەوت سەد ساڵ پێش ساڵی زایینییە.
٢. لەسەر چۆنیەتی بنیادنان و دروستکردنی ئەو شارە مێژوونووسان هاوڕانین، چونکە هەندێکیان پێیان وایە کە شاژنە (سەمیرامیس) ی پاشای ئاشوورییەکان لەسەردەمی خۆیدا ئەوشارەی دروستکردوە. دواتر لەسەردەمی دیاکۆی پاشای ماددا شارەکە تازەکراوەتەوە و فراوانکراوە.
٣. ژۆنە: ئەوشوێنەیە کە لەسەر شوراو دیواری قەڵاکان وەك سەنگەر و قوللە دروستدەکرێت و سەربازەکان لەوێوە پارێزگاری لە کۆشك و قەڵاکان دەکەن، هەروەها لەکاتی شەڕیشدا هەر لەوێوە تیر و شتی تر دەگرنە داگیرکەران و دوژمنەکانیان.

کۆشکە، لە داری (سیدر و سەروو) و بنمیچ و سەردەرگای دالانەکانیش، بە بەرگی زێڕین ڕووپۆشکراون، قەراغی هەر دیوارێکیش، بە ڕەنگێکی تایبەت ڕەنگ کراوە، کە یەکەم دیوار بە ڕەنگی سپی ڕەنگ کراوە، دووەم بە ڕەنگی ڕەش، سێیەم دیوار سوور، چوارەم ڕەنگی شین، پێنجەم بە نارنجی، دوو دیواری کۆتایش ڕەنگاوڕەنگ بوون، بەشی خوارەوەشیان، شەشەم زیوین و حەوتەم ڕەنگی ئاڵتونی بووە، کە شەش دیواری یەکەم و ڕەنگەکانیان ئاماژە بوون بۆ شەش هۆزە سەرەکییەکەی ماد. لە سەرچاوە ئاشوورییەکانیشدا، بەتایبەت لە هەڵکەندراوەکانی (شوش)[1] دا، ئەو ڕاستییە دەرکەوتووە، کە مادەکان لە هونەری بیناسازیدا، داهێنەر و سەرکەوتووبوون. لەناو وێنەکانی کۆشکی سارگۆنی ئاشوورییدا، کە لە (خورساباد) ی نزیک شاری نەینەوای پایتەختی ئاشوورییەکان دۆزراونەتەوە، باسی شارەکانی ماد کراوە. لەو وێنانەدا، ئەوە دەرخراوە، کە لەچاو شوێنی شاخاوی مادەکاندا، قەڵای بەهێز و گەورەیان هەبووە و زیرەکی بەرچاویان لەدروستکردنی ئەو کۆشک و قەڵایانەدا بەکارهێناوە. بەشێوەیەکی گشتی هونەری وێنەکێشانی مادەکان، کە لە ڕووی بەردەکانەوە هەڵکەندراون، ئەوە نیشان دەدەن، کە وەستایانی ئەو هونەرانە، لەگەڵ وەستایانی ئاشوورییەکان و ئیلامییەکاندا، ئاشنایەتیان هەبووە، زۆر نزیکە کە لەو وڵاتانەوە ئەو جۆرە وەستایانەیان هێنابێت، بۆ وڵاتی خۆیان، چونکە هونەری بەرد تاشی کۆشکی مادەکان، لەوکاتەدا، ئەو وەستایانە دروستیانکردووە، کە پێشتر لە ناوچەکانی وڵاتی ئاشوور و مانناییەکاندا، کاری وەستاییان کردووە. کۆشکی ڕازاوەی ئەکباتان، لەوکات و سەردەمەدا، نیشانە و بەڵگەی دەسەڵاتداری و دەوڵەمەندی پاشایانی مادی سەلماندووە. دیاکۆ ئەو شارەی بە بینای جوان

١. شوش: پاشماوەکانی ئەوشارە کەوتونەتە باکووری شاری ئەهواز لە ناوچەی خوزستانی ئێستای وڵاتی ئێران. شوش سەردەمانێك پایتەختی وڵاتی ئیلامییەکان بووە. دواتر بووەتە پایتەختی هاوینەی ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشیی.

و کۆشک و سەرا ڕازاندۆتەوە، هەرچواردەورەی کردووە بە قەڵا[1]. دواتر پاشا دەستورێکی تایبەتی دەرکردووە، بەو شێوەیەی خوارەوە:

١. پێکەنیین لەبەردەم پاشا، بەهەموو شێوەیەک قەدەغە بووە.

٢. لەبەردەم پاشا، تفکردن، ڕێگەی پێنەدراوە.

٣. ئاوڕشتن، قەدەغە بووە، لە ناوکۆشک و لەبەردەم پاشادا.

٤. نەکراوە و قەدەغە بووە، تەماشای ڕواڵەتی پاشا بکرێت.

ئەوکاتە لەناو مادەکاندا نەریتی کوڕنوش بردن بۆ پاشاکانیان باوبووە.

لەگەڵ ئەوانەشدا، دیاکۆ هەندێک دەستور و یاسای تریشی دەرکردووە، کە تایبەت بوون بە کاروباری دەوڵەتەوە،

وەک، کاروباری دەوڵەت دابەشکراوە بەسەر سەرۆک هۆزەکاندا، دەبوایە هەر کەسێک بچێتە لای سەرۆک هۆزی خۆی، بۆ کاری تایبەتی و کاروباری دەوڵەتی، ئینجا سەرۆک هۆزەکە پەیوەندی بە پاشاوە کردووە. کەس بۆی نەبووە، لەخۆیەوە خۆی بکات بە کۆشک و بارەگای پاشادا. هەروەک هیرۆدۆت ئاماژەی پێکردووە، کە سکاڵاو داخوازییەکانی خەڵک ،بەشێوەی نامەی نووسراو پێشکەش بە پاشاکراون، هەروەها هیرۆدۆت ئەوەی ڕونکردۆتەوە، کە دیاکۆ بەچاولێکردن لە یاسا و دەستوری پاشایانی ئاشووریی، بەرنامەکانی میوانداری و پێشوازی سەڵتەنەتی بەجێهێناوە.

دیاکۆ زیاتر لە نیو سەدە، واتە (٥٣) ساڵ فەرمانڕەوایی دەوڵەتی مادی کردووە، دواتر لە ساڵی (٦٥٥پ.ز)، کۆچی دوایی کردووە. جێگای باسە، هەتا

١. باگواس: خزمەتکاری تایبەتی (داریوشی سێیەم ٣٣٨-٣٣١پ.ز) پاشای هەخامەنشییەکان بووە، دوای داگیرکردنی وڵاتی هەخامەنشییەکان لەلایەن (ئەسکەندەری مەکەدۆنی٣٣١–٣٢٣پ.ز) ، بووە بە خزمەتکاری ئەسکەندەر، باگواس دوای دوو سەد ساڵ لە نەمانی مادەکان شاری ئەکباتانی بەچاوی خۆی بینیوە. دوای مردنی ئەسکەندەر بیرەوەرییەکانی لە شاری (ئەسکەندەرییە) ی میسر نووسیووەتەوە. دەڵێت: ئەکباتان کەوتبووە دامێن چیایەك، کۆشکێکی سپی و چواردەوری دیواری ڕەنگاوڕەنگ بووە، دیوارەکانی ڕەنگی سپی و سوور و ئاسمانی و نارنجی و ڕەش بوون، هەروەها کۆشکی پاشایەتی دیوارەکانی بە زێڕ و زیو ڕەنگێنرابوون، بەرهەیوانێکی فێنکی هەبوو کە ڕووە و کێوەکە دروستکرابوو.

ئێستا، شارەزایانی بواری کنە و پشکنین، نەیانتوانیوە گۆڕی دیاکۆی یەکەم پاشای ماد بدۆزنەوەو دیاری بکەن.



**قەلایەکی کۆن**

### دووەم: خشترتیە یان خەشار پاشا ( ٦٥٥-٦٣٣پ.ز)

لە مێژووی هیرۆدۆتدا، بە (فرائورتس) ناسراوە، کوڕی دیاکۆی دامەزرێنەری دەوڵەتی ماد بووە. لە دوای مردنی باوکی، وەکو دووەم پاشای مادەکان دەسەڵاتی گرتۆتە دەست. خشترتیە هەر چەندە ئاگاداری چارەنووسی باوکی بووە، کە لەلایەن ئاشوورییەکانەوە ئازاردراوە و ماوەیەکی زۆریش دیلکراوە، بەڵام هیچ کاتێک ملکەچی ئەوان نەبووە. خشترتیە لەسەرەتای دەستبەکاربوونیدا، لەگەڵ زۆرێک لە سەرۆک هۆزەکانی ناوچەکانی وڵاتی خۆی و خەڵکی وڵاتی ماننایيەکاندا، چەند قەڵا و ناوچەیەکی ئاشوورییەکانیان لەناو وڵات و سەرزەمینەکانی ماددا گەمارۆداوە، لەئەنجامی ئەوهێرشەدا، لەشکر و سەربازەکانی ئاشوورییەکان کەوتوونەتە ڕاکردن و خۆشاردنەوە، دواتر مادەکان ئەو قەڵایانەیان داگیرکردووە. ئەو کاتە ئاشوورییەکان زوربەی زۆری سەرزەمیینی ناوچەکانی مادیان لەژێر دەستدابووە، هەر بەو هۆیەوە، خشترتیە هەرەشەی ئازادکردنی لە دواناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئەوان کردووە. بەهۆی تێک چوونی باری ناوخۆیی وڵاتی ئاشوور، کە لەوکاتەدا، ئاشوورییەکان بەتەنیا ماونەتەوە، هاوپەیمانەکانیان لێیان جودا بوونەتەوە. دوای ئەو شەڕانە



کۆمەڵێک سەرباز

مادەکان لە هێرشەکەیاندا بۆسەر ئاشوورییەکان، ڕوویانکردۆتە شاری نەینەوای پایتەختیان، لەسەرەتاوە تا ڕادەیەک توانیویانە سەریکەون بەسەر ئاشووریەکاندا. هەربۆیە لەئەنجامی ئەو شکەستەدا، ئاشوورییەکان بڕیاریانداوە، کە لەگەڵ خشترتیە گفتوگۆ بکەن، بەو مەبەستە چەند نوێنەرێکیان ناردوە بۆ لای خشترتیەی پاشا و سەرکردەی شۆڕشگێڕەکان، لەئەنجامی ئەو گفتوگۆیەدا، ئاشوورییەکان هەوڵیانداوە، کە ناکۆکی و دوو بەرەکی بخەنە ناو ڕیزەکانی لەشکری پاشای مادەوە، چونکە بۆ ئەو مەبەستە بەجیا قسەیان لەگەڵ کردوون. لە هەمانکاتدا، ئاشوورییەکان بەمەبەستی هاوپەیمانی دروستکردن، گفتوگۆیان لەگەڵ (سکتییەکان)[1]یش کردووە.

بەگوێرەی بابەتە نووسراوەکان و سەرچاوە مێژووییەکانی ئاشوورییەکان، دوای هاتنی سکتییەکان، بۆ سەرزەمینی وڵاتی ماد، (ئاشوور پانیپاڵ ٦٦٨- ٦٢٧پ.ز)، کوڕی ئەسەرهەدوون، لەوهەلە کەڵک وەردەگرێت. بۆ ڕێگرتن لە هێزی ڕوو لە زیاد بووی مادەکان، کچی خۆی دەدات بە (بارتاتوا)ی میری سکتییەکان، کە بارتاتوا پێشتر داوایکردووە. هەتا بتوانێت سکتییەکان بکات بە هاوپەیمانی خۆی، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ لەشکری مادەکاندا. لەئەنجامدا، مادەکان بەهۆی هێرشی سوپای سکتییەکانەوە، دەست لە گەمارۆدانی وڵاتی ئاشوور هەڵدەگرن و پاشەکشە

---

١. سکتییەکان: ئەوانە لە سەرەتای فەرمانڕەوایی خشترتیەوە هاتوونەتە ناوخاکی مادەکان. سکتییەکان خەڵکانێکی بەرەگەز ئاری هیندۆئەورووپایی بوون. لە تەوراتیشدا بە (ئاجوج و مأجوج) ناسراون. ئەوان دانیشتووی ڕەسەنی ناوچەکانی ژووروی کەنارەکانی دەریای ڕەش واتا وڵاتی (ئۆکرانیا) ی ئێستا بوون. دواتر لە ڕێڕەوی دەربەندی قەفقازەوە بۆ سەرزەمینەکانی وڵاتی ماد هاتوون و لەوکاتەدا چەند ناوچەیەکیان لە زەوی مادەکان داگیرکردوە. بەپێی وتەی هیرۆدۆتیش سکتییەکان لە ناوچەکانی ئاسیای ناوەڕاستەوە هاتوون. ئەوانە کڵاوی نوک باریکیان لەسەرناوە و لەکاتی کۆچەکەیاندا ئەسپی بچوك و کوڵکنیان پێبووە. بەڵگەی ئەوەش وێنەی سوارە کڵاوباریکەکانە کە لەسەر ڕووی دەفری یۆنانییەکان لەسەدەی حەوتی پێش زایندا نەخشێنراوە. کە ئەو وێنانە بۆ سکتییەکانی ئاسیای ناوەڕاست دەگەڕێنەوە. بەڵام هەندێکی تر لە شارەزایانی ئەو بوارە، وڵاتی (کازاخستان) ی ئێستایان بە زێدی سکتییەکان داناوە. بەپێی نووسراوی هیرۆدۆت. سکتییەکان لەسەردەمی خۆیاندا کاتێك کە دوژمنێکی خۆیان کوشتووە خوێنەکەیان خواردۆتەوەو دواتر سەرەکەیان بڕیوەو بردویانە بۆ پاشاکەیان، ئینجا پێستەیان کەوڵکردوە. ئەو دوژمنەشی کە زۆر قینیان لێی بوبێت سەرەکەیان لێکردۆتەوەو لەناو ماڵەکانیاندا دایانناوەو نیشانی میوانەکانیانداوە کە ئەوە سەری دوژمنەکەیانە. هەروەها سکتییەکان زۆر باوەڕیان بە فاڵگرتنەوەو جادوگەری هەبووە. ئەگەر یەکێکیشیان پیربوایە خزمەکانی کۆبوونەتەوەو دواتر کوشتوویانە، چونکە پێیان ناخۆش بووە کەسێکیان بەمردنی ئاسایی بمرێت.

دەکەن. بەپێیی ئەو نووسراوانە لەو شەڕانەدا، سکتییەکان توانیویانە لەشکری مادەکان بشکێنن و وڵاتەکەیان داگیربکەن. مادەکان لە ساڵی (٦٥٣- ٦٢٥پ.ز)، واتە ماوەی (٢٨) بیست و هەشت ساڵ بوونەتە ژێردەستە و باجدەری سکتییەکان. لەوکاتەدا، سکتییەکان شاری (سەگز) سەقزی ئێستایان کردۆتە پایتەختی دەوڵەتەکەیان، وەکو هاوپەیمانێکی دڵسۆز و بەهێزی ئاشوورییەکان لەو ناوچانەدا، فەرمانڕەواییان کردووە.

دوای (٢٠) بیست ساڵ ژێر دەستەیی و باجدەری مادەکان بۆ سکتییەکان، ساڵی (٦٣٣ پ.ز) مادەکان لە شەڕێکدا لەگەڵ ئاشوورییەکان و سکتییەکان، لەشکرەکەیان بە سەختی تێکشکاوە و خشترتیەی پاشاشیان لەلایەن ئاشوور پانیپاڵی پاشای ئاشوورەوە لەو شەڕە سامناکەدا دەستگیرکراوە و کوژراوە، بەشێکی زۆری سوپاکەشی لە شەڕەکەدا لەناوچووە. جێگای ئاماژە پێکردنە بەپێیی لێکۆڵینەوە شوێنەوارییەکان، دواتر خشترتیە پاشا لە ئەشکەوتی فەخرەقا نێژراوە.


ئەشکەوتی فەخرەقا

## سێیەم: هوخشترە (٦٢٥-٥٨٥پ.ز)

(کەی ئەخسار یان کەیخوسرەو) یشی پێگوتراوە. هیرۆدۆت بە (کیاکسارس) ناوی بردووە. کوڕی خشترتیەی پاشای مادە. هوخشترە کاتی کوژرانی باوکی لەلایەن ئاشوورییەکانەوە منداڵ بووە، بۆیە دوای ماوەیەکی تر توانیویەتی لە شوێنی باوکی دابنیشێت. هوخشترە بە بەدەسەڵاتتریین و مەزنتریین پاشای ماد ناسراوە. هیچکام لە پاشایانی ماد تەکبیر و بیرتیژی ئەویان نەبووە، لەهەمانکاتیشدا، زۆر جەنگاوەر بووە. دوای دەستبەکار بوونی هوخشترە، یەکەم کاری ئەو لە ساڵی (٦٢٥ پ.ز)دا، پلانی ئازاد کردنی مادەکان بووە لە سکتییەکان، بەو هۆیەوە توانیویەتی ژمارەیەکی زۆری سکتییەکان بکوژێت، ئەو کوشتارە دوای ئەوە ڕوویداوە، کە سکتییەکان بۆ میوانداریی هوخشترە بانگهێشت کراون، دواتر بە شەڕاب سەرخۆشکراون، ئینجا هوخشترە و پیاوەکانی هەڵیانکوتاوەتە سەریان و توانیویانە پاشای سکتییەکان (مادیاسی کوڕی پروتوتی) بکوژن. بەو جۆرە مادەکان خۆیان لە ژێر دەستەی سکتییەکان ڕزگار کردووە. دواتر هوخشترە هەوڵیداوە سوپای ماد بەشێوەیەکی پێشکەوتوو و مۆدێرن ئامادە بکات، بەشێوەیەکی زۆر جوان سوپاکەی تۆکمە کردووە. هیرۆدۆت لە بارەی ڕێکخستنی لەشکری مادەکانەوە لەسەردەمی هوخشترەدا، باسی سوارەکانی مادی کردووە، کە لەوکاتەدا، هوخشترە لەشکرەکەی لە دەستەی جۆراوجۆری وەک، (سەربازی سوارە و پیادە، نێزەدارەکان، تیرهاوێژەکان) و هتد....ئامادە کردووە، بەپێیی چەکەکانیان، بەسەر یەکە بەش بەشکراوەکاندا دابەشیکردوون، هەر بەشێکیانی بەجیا پەروەردەکردووە، بۆ ئەوەی بە شێوازی تایبەت کەڵکیان لێوەربگرێت، لە مەیدانی شەڕدا. هوخشترە شێوازی شەڕکردنی لە بنەڕەتەوە گۆڕیوە. ئەو سوارانەی هوخشترە لەوکاتەدا ئەوەندە کارامەو ئازا بوون، کە بەشێک لە ئەوان بە سواری شەڕیانکردووە. ئەگەرچی زوربەی سەربازەکانی لە مادە ڕەسەنەکانی ناوچەکە بوون، بەڵام هوخشترە سەربازی بە نەتەوە ژێردەستەکانیشی کردووە، کە تازە دەوڵەتی ماد بەسەر ئەواندا سەرکەوتووە و بوونەتە ژێردەستە و

باجدەری مادەکان، چونکە هوخشترە بۆ فراوانکردنی سەرزەمینی وڵاتی خۆی، لەلای خۆرهەڵات و باشوورەوە هەوڵیداوە، کە بەشێک لەو سەرزەمینانەی خستونەتییە ژێر دەسەڵاتی خۆی، ناوچەکانی پارس بووە.

## شەڕی نەینەوا (٦١٢پ.ز)




کاتێک هوخشترە دڵنیابووە لەوەی، کە سوپاکەی بە ئەندازەیەکی تەواو گەورەیە و شایەنی تێکشاکان نییە. هەر بۆیە بۆ بەدەستهێنانی ئامانجە سەربازییەکانی خۆی، لە ساڵی (٦١٦پ.ز)، لە هەوڵی دۆزینەوەی هاوپەیمانێکی ڕاستەقینە و نوێدا بووە، لەئەنجامدا، هوخشترە لەگەڵ (نەبو پۆلاسەر٦٢٥- ٦٠٥پ.ز)، پاشای (کلدانییەکان)، کە لە بابل نیشتەجێبووە، پەیمانی هاوکاریکردنی یەکتریان بەستووە. نەبو پۆلاسەر ساڵی (٦٢٥پ.ز) لەلایەن ئاشوورییەکانەوە، بە فەرمانڕەوایی بابل دانراوە، ئەوانیش وەکو مادەکان ژێردەستە و باجدەری ئاشوورییەکان بوون. هوخشترە بەو بیانووە هێرشی کردۆتە سەر ئاشوورییەکان، تاکو تۆڵەی باوکی و خەڵکی ماد لە ئاشوورییەکان و جێنشینی ئاشوور پانیپاڵ بستێنێتەوە، نەینەوای پایتەختیشیان داگیر و وێران بکات. هوخشترە بە بەرنامە و پلانێکی پێشوەخت و کاربۆکراوەوە

هێرشیکردۆتە سەر وڵاتی ئاشوورییەکان، هوخشترە ئاگاداری ئەوە بووە، کە دەوڵەتی ئاشوورییەکان لە ساڵەکانی کۆتایی تەمەنیدایە و لەهەموو لایەکەوە، ڕووی لە سستی کردووە. هەندێک لەسەرچاوە مێژووییەکان وایدەردەخەن، کە هوخشترە سوپاکەی خۆی بەشێوەی سوپای ئاشوورییەکان ئامادەکردووە، سوور بووە لەسەر ئەوەی، کە دەبێت ئیمپراتۆرییەتی بەهێزی ئاشوورییەکان لەناوبەرێت. بەومەبەستە سوپایەکی نوێیی ڕێکخستووە، کە لەجیهانی ئەوسەردەمەدا، بە بەهێزترین سوپا لەناوچەکەدا ئەژمارکراوە.

ساڵی (٦١٦پ.ز) لەگەڵ نەبو پۆلاسەری پاشای بابل، لە لای خۆرهەڵات و باشووری وڵاتی ئاشوورەوە، دەستیانکردووە بە جموجۆڵ و هێرش و لەشکرکێشی، بەرەو ناوچەکانی ناوجەرگەی وڵاتی ئاشوور. سوپا و لەشکری مادەکان، بە ڕابەرایەتی هوخشترە لە لای خۆرهەڵاتەوە و بە قەدپاڵی شاخەکانی زاگرۆسدا تێپەڕیون، ئەو کاتە مادەکان لە دوو قۆڵەوە، ڕویانکردۆتە ناوچەو سەرزەمینەکانی وڵاتی ئاشوورییەکان:



**نەبوخوزنەسری دووەم/ بابل**

**قۆڵی یەکەم:** بۆ ناوچەکانی دەشتی (ئارابخا)، کەرکوکی ئێستا.

**قۆڵی دووەم:** لە ڕێیی شاخەکانی دەورووبەری شارۆچکەی (ڕەواندز)ی ئێستاوە، بەرەو ناوچەکانی دەشتی (ئەربائیلۆ)[1] کەوتوونەتە ڕێ. ساڵی (٦١٥پ.ز)، واتا دوای کەمتر لە ساڵێک، لە دەستپێکردنی هێرشەکانیان هوخشترە شاری ئارابخای گرتووە، کردویەتییە مەڵبەندی سوپاکەی و بنکەی سەربازەکانی بۆ شەڕەکە، کە ئەو شارە بەدووری (٩٦ کیلۆمەتر)، دەکەوێتە باشووری خۆرهەڵاتی شاری نەینەوای پایتەختی وڵاتی ئاشوورییەکان. مادەکان بە سوپایەکی (٤٠٠٠٠) چوار سەد هەزار کەسییەوە، ڕویانکردۆتە وڵاتی ئاشوورییەکان. مادەکان لە هێرشەکەیاندا، ڕووبەڕووی بەرگرییەکی کەمی ئاشوورییەکان بوونەتەوە، هەر بۆیەش ساڵی دواتر دووبارە هێرشیانکردۆتەوە، بۆ سەر ناوچەکانی وڵاتی ئاشوورییەکان. داگیرکردنی وڵاتی ئاشوورییەکان ساڵی



**ڕێککەوتنی نێوان ماد و بابل**

---

١. ئەربائیلۆ: واتا شاری هەولێری ئێستای پایتەختی حکومەتی هەرێمی کوردستان، کە لە سەردەمی ئاشوورییەکاندا شارێکی پیرۆز و گرنگ بووە، چونکە ئەوشارە ماڵی (ئەشتار) ی خوای ئاشوورییەکان بووە.

(٦١٤ پ.ز) دەستیپێکردووە، واتا شەڕی نێوان مادەکان و ئاشوورییەکان تەنها (٢) دوو ساڵی خایاندوە. دوای چەند سوکە شەڕێکی لاوەکی، لە نێوان مادەکان و ئاشوورییەکاندا، سوپای هوخشترە هەتا نزیکترین و پیرۆزترین شارەکانی وڵاتی ئاشوورییەکان پێشڕەوییانکردووە. سوپای ماد بە سەرکردایەتی پاشا هوخشترە، شار و ئاوایییەکانی ئاشوورییەکانیان یەک لە دوای یەک داگیرکردووە، یەکەمجار هوخشترە شاری (تەربیس)ی داگیرکردووە، کە ئەو شارە کەوتۆتە سەر کەناری رووباری دیجلە، هەر لەو ساڵەدا، شاری (ئاشوور) قەلای شەرگاتی ئێستا، کە دووەم گەورە شاری وڵاتی ئاشوورییەکان بووە، لەلایەن ئەوانەوە داگیرکراوە. ئینجا رووی لەشکرەکەیان بەرەو شاری (نەمروود) کالخ رۆیشتووە، کاتێک گەیشتونەتە ئەو شارە، هێرشیانکردۆنە سەر قەڵا گەورەکەی شەلمانسەری سێیەم، کە لە سەدەی نۆیەمی پێش زایینda، دروستیکردووە، لەوکاتەدا، وەکو خەزێنەیەک بۆ کۆکردنەوەی نووسراوە بزمارییەکان بەکارهاتووە. جێگای ئاماژەیە، کە پێشئەوەی لەشکر و هاوکاری بابلییەکان بگاتە سوپای ماد، هێزەکانی هوخشترە لە وەرزی هاوین، واتا مانگی (٨ی ساڵی ٦١٢ پ.ز)، هێرشیانکردۆتە سەر ناوجەرگەی ئیمپراتۆرییەتی ئاشوورییەکان،

لەئەنجامدا، ئەو شەپۆلی وێرانکارییە گەیشتۆتە دەروازە گەورەکانی شاری نەینەوای پایتەخت، کە چواردەووری شارەکە بە دیوار و شوورەی بەرز و تۆکمە دەوردراوە، بناغەی ئەو شورایانە بە بەردی گەورە و قسڵ و دیوارەکانیشی بەخشت دروستکراون. دوای گەمارۆیەکی دوور و درێژی شاری نەینەوا، لەلایەن سوپا و سەربازەکانی هوخشترەوە، بەپێیی سەرچاوە مێژووییەکان دواتر مادەکان بۆ داگیرکردنی شاری نەینەوا، بیریان لەوە کردۆتەوە، کە ئاوی رووباری دیجلە لە رێیی چەند خەندەکێکەوە بەرە و شارەکە ئاراستە بکەن[1]. دواتر ئەو لافاوە شورا گڵینەکانی دەورووبەری شارەکەی رووخاندوە، ئینجا مادەکان توانیویانە بچنە ناو

١. پێشتر زانایەك گوتوویەتی: شاری نەینەوا کەس ناتوانێت داگیری بکات مەگەر کاتێك رووبارەکە ببێ بە دوژمنی.

شارەکەوە. دوای ئەوەی دوا پاشای وڵاتی ئاشوورییەکان (سین شاریشکون ٦٢٣ - ٦١٢ پ.ز)، کە بە (ساراک) ناسراوە، کوڕی ئاشوور پانیپاڵ بووە، کە دەزانێت کارلەکار ترازاوە و هیچ بەرگرییەکی پێناکرێت، خۆی و هەموو خێزان و کەسوکاری و گەنجینەکانی بردووەتە ناو دوا قەڵای شارەکە و ئاگری تێبەرداون. سەرئەنجام هەموویان سوتاون. دواتر بەشێکی زۆری لەشکر و سەربازەکانی لەگەڵ دانیشتوانی شارەکەدا، لەئەنجامی ئەو داگیرکارییەدا کوژران، یان لە وڵات هەڵهاتوون. بەپێیی سەرچاوە مێژووییەکان دوای داگیرکردنی شاری نەینەوا، لەلایەن لەشکری مادەکان، ئینجا سوپای بابلییەکانیش بۆ کۆمەک و پشتیوانی، لەشکری مادەکان گەیشتوونەتە ناوچەکە. (گاهاشماری) بابلی ڕووداوەکەی بەو شێوەیە نوسیووە: (پاشای ماد لە دیجلەوە هێرشی هێنا، لەبەرامبەری ئاشووردا، جێیی خۆی کردەوە. پاشان هێرشیکردە سەر شار و ئەوێیی داگیرکرد، ئەو شارەکەی وێرانکرد و شکستییەکی سەختی بەسەر خەڵک و پیاو ماقوڵەکاندا سەپاند).

دوای ئاگردانی قەڵاکانی نەینەوا و داگیر و وێرانکردنی شارەکە، فەرماندە و سەرلەشکری ئاشوورییەکان، کە لە خۆرئاوای وڵات سەرگەرمی شەڕ بووە، لەهەمانکاتیشدا، هەمیشە خوازیاری ئەو ڕۆژە بووە، کە تاج و دەسەڵاتی وڵاتەکەی بکەوێتەدەست، ناوی (ئاشوور ئۆبلات)[1]ی لەخۆیناوە و بەپەلە ئەو سەربازە ئاشوورییانەی کۆکردۆتەوە، کە لە داگیرکردنی وڵاتەکەیدا بەسەلامەتی ڕزگاریان بووە، ئاشوور ئۆبلات و سەربازەکانی بەرەو خۆرئاوای وڵات هەڵهاتوون و لە شارێک بەناوی (حەڕان)، کە ئێستا دەکەوێتە وڵاتی سوریاوە، لە نزیک کەنارەکانی ڕووباری فورات، دواین بەرگرییان ڕێکخستووە.

بەپێیی نووسراوەکەی (گاهاشمار) ی بابلی، دواتر سوپای مادەکان و

١. ئاشوور ئۆبلات: برابچوکی ئاشوور پانیپاڵ و مامی ساراك بووە. ئەوکاتە خۆی بەناوی (ئاشوورئۆبلاتی یەکەم ١٣٦٥-١٣٣٠پ.ز)ەوە ناوناوە، کە ئەوپاشایە لەوکاتەدا پاشای ئاشوورییەکان بووە و وڵاتی ئاشووریی لە دەستی میتانییەکان ڕزگارکردوە و خولێکی تازەی پاشایانی ئاشووریی دامەزراندوە.

بابلییەکان لە ساڵی (٦١٠ پ.ز)، بەرە و حەڕان پێشڕەوییانکردووە، بۆ گرتنی دوایین شار و سەربازی ئاشوورییەکان، بەڵام ئاشوور ئۆبلات و سوپاکەی لە ترسی هێرشی مادەکان و بابلییەکان شارەکەیان چۆڵکردووە. دوای ماوەیەکی کورت لە پاشەکشە و هەڵهاتنیان، ئاشوور ئۆبلات گەڕاوەتەوە و تێکۆشاوە، کە شاری حەڕان بگرێتەوە، بەڵام سەرنەکەوتووە و کوژراوە. کۆتایی بە دوایین پاشماوەی فەرمانڕەوایی ئاشوورییەکان هاتووە. دوای کۆتاییهاتنی یەکجاری دەسەڵاتی دوا سەربازی ئاشوورییەکان، لە ناوچەکە، پاشان مادەکان و بابلییەکان سەرزەمین و ناوچەکانی وڵاتی ئاشوورییان لە نێوان خۆیاندا دابەشکراوە، کە سنوورەکەی لە شاری حەڕانەوە بەرەو خۆرهەڵات، هەتا سەر ڕووباری دیجلە درێژ بۆتەوە، دواتر بەکەنارەکانی ڕووباری دیجلەدا شۆڕ بۆتەوە، هەتا دەورووبەری ناوچەکانی شاری ئارابخا، واتا بەشی باشوور و خۆرئاوای وڵاتی ئاشوورییەکان بۆ دەوڵەتی کلدە و لای باکوور و خۆرهەڵاتیش، بووە بە بەشێک لەسەرزەمیین و خاکی مادەکان. پاشماوە و تاڵانی شاری حەڕانیشیان، بە دوو جۆر بەسەرخۆیاندا دابەشکردووە. مادەکان پاشماوەی دیلەکان بەهەموو پێداویستییەکەوە و بابلییەکانیش شارەکە و سەرزەمینەکەیان بەرکەوتووە.

تا ئەو کاتە سوپای لەشکست نەهاتووی ئاشوورییەکان، بە بەهێزترین و بە بەناوبانگترین هێزی ناوچەکە دانراوە، هەردەم چاوی داگیرکارییان هەبووە، هێرشیان کردۆتە سەر نەتەوەکانی دەرو دراوسێیان، هەموو ناوچەکە ترسی ئەوانی لێنیشتووە و لێیان ترساون. بەهۆی چەند هێرشێکی سەرسەختانەی سوپای لێهاتووی مادەکانەوە، کە لەلایەن بابلییەکانەوە کۆمەک و هاوکاری دارایی و سەربازی کراون، لەناوچوون و شاری نەینەوای پایتەختیشیان داگیرکراوە. لەشکرکێشییەکی کورت، بەڵام ترسناک لەلایەن سوپای مادەکان و بابلییەکان بەشێوەیەک بەهێز و وێرانکەر بووە، کە ناوچە سەرەکییەکانی وڵاتی ئاشوورییەکانی یەکپارچە کردۆتە وێرانە.

دیسان (گاهاشمار) ی بابلی بەو شێوەیەی خوارەوە باسی داگیرکاری و وێرانکردنی

پایتەختی وڵاتی ئاشوورییەکانی کردووە: (پاشای ئەکەد بابل و هوخشترە، ئەوان بەدرێژایی کەنارەکانی دیجلە پێشرەویانکرد، لە نەینەوا بە هێزەوە هێرشیان کردە سەر شار، لە مانگی خەرماناندا شار گیرا. بە کۆمەڵکوژی لە خەڵک و پیاوماقوڵەکان ئەنجامدرا، لەوڕۆژەدا، (سین شاریشکون) پاشای ئاشوور هەڵهات، لە شار ئەوان سەرکەوتن و شارەکەیان بۆ تەپۆڵێک لە وێرانە گۆڕی).

هەر لەو بارەیەوە نامەیەکی خودی نەبو پۆلاسەری پاشای بابلییەکانیش دەخەیتە ڕوو: (من ناوچەی ئاشوورم کۆمەڵکوژ کرد، ناوچەی دوژمنم بۆ تەپۆڵێک لە وێرانە گۆڕی، ئاشوورییەکان کە ڕۆژگارێکی دوور و درێژ بەسەر هەموو ئەو نەتەوانەدا فەرمانڕەواییانکردبوو، بە قۆچە بەردینەکانیان ئازاریان بەخەڵکی ناوچەی بابل

تێبینی: بەشێک لەو بابەتەم لە ژمارە (١٤) بەهاری ٢٠١٠ ی گۆڤاری پشدەر لە ژێر ناوی (ئێمە نا، بەڵکو مێژوو کوردستانێتی بوونی بەشێک لە شاری موسڵ دەسەلمێنێت) بڵاوکردۆتەوە.




**وڵاتی ماد دوای گیرانی نەینەوا**

## دوا ڕووداوی مادەکان و سکتییەکان

دوای ئەو شەڕ و بەسەرهاتانەی سەرەوە، دواتر مادەکان و سکتییەکان لەسەر ڕووداوەکانی پێشووتریان، چاوپۆشیانکردووە و ئاشتبوونەتەوە، هەر بۆیە سکتییەکان بڕیاریانداوە هاوکار و هاوپەیمانی مادەکان بن. بەهۆی ئەوەی کە سکتییەکان لە هونەری شەڕ و ئەسپ سواری و ڕاودا، شارەزاییەکی باشیان هەبووە، هوخشترە بڕیاریداوە، کە کوڕەکانی خۆی بە سکتییەکان بسپێرێت. هەتا زمان و هونەرە جەنگییەکانی ئەوان فێرببن، چونکە هوخشترە شەیدای تیر هاوێژی سکتییەکان بووە. سکتییەکان هەر کاتێک چونەتە ڕاو، نێچیرێک یان چەند نێچیرێکیان ڕاو کردووە، دواتر بەشێکیان هێناوەتەوە بۆ پاشا، بەڵام ڕۆژێک کە لەگەڵ پاشا هوخشترە چوونەتە دەرودەشت، بۆ ڕاو، بەدەستی بەتاڵەوە لە ڕاو گەڕاونەتەوە. هەر لەوکاتەشدا، هوخشترە گەیشتۆتە لایان و زۆر لێیان تورە بووە، چونکە هیچیان بۆ خۆی و میوانەکانی ڕاو نەکردووە. سکتییەکان کە ئەو تورەبوونەی پاشایان بینیووە، وەک ئەوەی کە بیانەوێت تۆڵەی خۆیان لە هوخشترە بکەنەوە، بەرامبەر بەو ستەمەی کە پێشتر لێیکردبوون، هەڵساون بە کوشتنەوەی یەکێک لە کوڕە گچکەکانی پاشا، کە پێیی سپاردبوون، دواتر برژاندویانە و کردویانەتە کەباب، گوایە ئەوە گۆشتی نێچیرە، گۆشتەکەیان بەشێوەیەک ئامادەکردووە وەک ئەوەی، کە گۆشتی نێچیربێت و لەکاتی ئاسایدا ڕاوییانکردبێت، بۆیە هوخشترە و میوانەکانی تێر لە گۆشتی کوڕەکەیان خواردوە. دواتر ئەو کەسانەی کە ئەو کارەیان ئەنجامداوە، بە پەلە کەوتونەتەڕێ، بۆ لاى پاشای (لیدی)، کەلە ناوچەکانی ئاسیای بچوک، وڵاتی تورکیای ئێستا، فەرمانڕەوا بوون. لە (ئالیاتیس)ی کوڕی (سادیاتیس)ی پاشای لیدی، داوای پەناهندەییان کردووە.

کاتێک هوخشترە بەو کارەی زانیووە، داوای لە پاشای لیدی کردووە، کە ئەو کەسانە لە سکتییەکان بگەڕێنێتەوە، هەتا لە بری ئەو کارەیان، بە سزایان بگەیەنێت،

بەڵام ئالیاتیس بەبێ گوێدان بە خواستی پاشای ماد، ئەوانی لە داڵدەی خۆیدا هێشتۆتەوە. هەر بۆیە هوخشترە دوای سەرکەوتنی لە داگیرکردن و ڕووخاندنی دەوڵەتی ئاشوورییەکان، بە مەبەستی تۆڵە سەندنەوە لە پاشای لیدی و سکتییەکان جارێکی تر، ڕووی هێرشیکردۆتە سەر ناوچەکانی باکوور و باکووری خۆرئاوای وڵاتەکەی. لەئەنجامی هێرشەکەی هوخشترەی پاشای ماد، کە بۆ سەر وڵاتی لیدی ئەنجامی داوە، بەهۆی بەرەنگاربوونەوە و ڕێگری ئوورارتوویيەکان، لەبەردەم سوپای مادەکاندا، کە ویستوویانە بەسەر خاکی وڵاتەکەیاندا تێپەڕ نەبێت، لەئەنجامدا، مادەکان ساڵی (٥٩٠پ.ز) توشی شەڕکردن و ڕووبەڕووبوونەوە بوونەتەوە لەگەڵیاندا، سەرئەنجام تەواوی ناوچەکانی وڵاتی ئوورارتوو لەلایەن سوپای هوخشترەوە داگیرکراوە و کردویانەتە بەشێک لە دەوڵەتەکەیان. دواتر سەرانسەری وڵاتی ئەرمەنستان و ناوچەکانی قەفقازی ئێستایان داگیرکردووە. پاشان لەشکری هوخشترە، لە ڕێگای شاخەکانی (تۆرۆس)ەوە، بەرە و سەرزەمینی وڵاتی لیدییەکان پێشڕەویانکردووە. لە ساڵی (٥٩٠پ.ز)، لەگەڵ هێزەکانی لەشکری لیدییەکان، ڕووبەڕوو بوونەتەوە. بەپێی هیرۆدۆت شەڕی ماد و لیدییەکان (٥) پێنج ساڵی خایاندوە، واتا ساڵی (٥٩٠ –٥٨٥ پ.ز). کە ئەو شەڕە لە مێژوودا، بە شەڕی (کسوف) ناسراوە. دوای پێنج ساڵ شەڕکردن لەنێوان سوپای ماد و لیدییەکاندا، لە کەنارەکانی سەر ڕووباری (هالیس)[1]، لە نزیک ئاوایی (بحبوحە)، لە بەرواری (٥٨٥/٥/٢٨ پ.ز) ئەو ڕۆژە لە ناکاو ڕۆژ گیراوە و سەرتاسەری جیهان بووە بە شەوی تاریک[2]. لەهەمانکاتدا، بە بڕوای هەر دوولا ئەو ڕۆژگیرانە تورەیی خواکانی ئەوان بووە، لە بەرامبەر ئەوشەڕەی ئەواندا. دواتر هوخشترە و ئالیاتیس بڕیاریانداوە، کە شەڕەکە ڕابگرن و ڕێککەوتنێک لەنێوان خۆیاندا واژۆ بکەن، بەوهۆیەوە بڕیاریانداوە، دوو

---

١. هالیس: ئێستا بە ڕووباری (قیزل ئیرماق) ناسراوە، کە بە دووری (٥٠کیلۆمەتر) دەکەوێتە خۆرهەڵاتی شاری (ئەنکەرە) ی پایتەختی ئێستای تورکیاوە.

٢. ئەو ڕۆژگیرانە ساڵێك پێشتر (تالیس) ی ئەستێرناس و بیرکاریزانی بەناوبانگی شاری (ملیتە) پێشبینی کردوە.

کەس وەکو ناوبژیوان دەستنیشان بکەن، بۆ دادوەریکردن لە نێوانیاندا. کە لەلایەن پاشای لیدییەوە، (نەبوو خزنەسری دووەم ٦٠٥-٥٦٢ پ.ز) فەرمانڕەوای تازەی بابل دیاریکراوە، هوخشترەش (سیدنس)ی فەرمانڕەوای (کلیکییە)ی وەکو نوێنەری خۆی ڕاسپاردوە. دواتر شەڕەکە بەبێ سەرکەوتنی هیچ لایەک کۆتایی پێهاتووە، بەو جۆرە لەشکری پاشای ماد و لیدییەکان گەڕاونەتەوە بۆ شوێنی پێشوتری خۆیان، لەسەر ئەوە پێکهاتوون، کە ڕووبای هالیس ببێتە سنوری سەرەکی و لێکجیاکەرەوەی هەر دوو دەوڵەتەکە. دوای ڕێککەوتنەکە هەردوولا، بڕیاریانداوە، ژن و ژنخوازی بکەن. لە ئەنجامدا، کچی پاشای لیدییەکان، بە ناوی (ئاریانیس) لە (ئاشداهاک)ی کوڕی هوخشترە پاشای ماد مارەکراوە، هەروەها (ئامیتیس)ی کچی هوخشترەش، لە (نەبوو خزنەسری دووەم)ی پاشای بابل مارەکراوە[1]. بەوکارەیان هاوپەیمانە ئاشتییەکەیان بەهێز تر کردووە. دوای مارەکردنی کچی پاشای لیدییەکان لە کوڕی پاشای مادەکان، دواتر هەردوو پاشاکە سوێندی وەفادارییان خواردوە[2]. ئەو پەیمانە ئاشتییە بەهێزە، بەوجۆرە هاوسەنگی سیاسی لەناوچەکەدا هێناوەتە ئاراوە، بەڵام بەداخەوە هوخشترە زۆر نەژیاوە هەتا بە چاوی خۆی ئەو ئاشتەواییە دوور و درێژەی

١. یەکێك لە (٧) حەوت شوێنە سەرسوڕهێنەرەکانی جیهان، (باخچە هەڵواسراوەکانی بابل)ە، کە (نەبوو خزنەسری دووەم ٦٠٥ - ٥٦٢پ.ز) پاشای بابلییەکان، ئەو باخچە چین لەسەر چینانەی بۆ (ئامیتیس) ی کچی (هوخشترە) ی پاشای مادەکان دروستیکردوە، دوای ئەوەی کە بووە بە هاوسەری، چونکە ئامیتیس لە شاری (ئەکباتان) هەمەدانی ئێستا، لە ناو دارستان و ناوی سازگار و شاخە بەرزەکان ڕاهاتووە و فێری ئاو و هەوای کوێستان بووە، هەر بۆیە نەیتوانیووە وا بە ئاسانی لەگەڵ ئاو و هەوای ناوچە گەرمەکانی بیابانی بابل هەڵبکات. بۆ ئەومەبەستە و لە بەرامبەر خۆشەویستی بۆ ئامیتیس. پاشای بابل کۆشکێکی (٧) حەوت نهۆمی دروستکردوە، کە هەر نهۆمەی بە باخچەی جوان ڕازێندراوەتەوە، وەکو شاخە بەرزەکانی ئەکباتان. هەروەها دەوری کۆشکەکەشی بە باخچە و گوڵی جوان و بۆن خۆش ڕازاندۆتەوە. ئاودێری ئەو باخانەشی بەشێوەی چین لەسەر چین و زۆر پێشکەوتوو دروستکردوە و لە شوێنی دوورەوە ئاوی بۆ ڕاکێشاوە. بۆ ئەوەی ئاو و هەوای بابل کار نەکاتە سەر شا ژن.

٢. دوای مارەکردنی کچی پاشای ئیدی لە کوڕی پاشای ماد، دواتر هەردوو پاشا سوێندی وەفادارییان بۆیەکتر خواردووە، کە سوێندەکە بەوشێوەیە بووە، لایەنەکانی سوێند خۆر سەرەتا خۆیان بریندار کردووە، دواتر خوێنی یەکتریان هەڵمژیووە و ناوی (خوێنی برایەتی) یان لەسەر یەکتر داناوە.

که ماوەی زیاتر له (٣٠) سی ساڵی خایاندوه له نێوان مادەکان، لیدییەکان و کلدانییەکاندا ببینێت، چونکه له هەمان ساڵی واژۆکردنی ڕێککەوتنەکەدا، واتا ساڵی (٥٨٥ پ.ز) کۆچی دوایی کردووه.

هوخشترەی کوڕی خشترتیەی کوڕی دیاکۆ، (٤٠) چل ساڵی له تەمەنی خۆی به فەرمانڕەوایی دەوڵەتی ماد بەسەر بردووه، له تەمەنی خۆیدا، هوخشتره توانیویەتی گەورەترین سەرکەوتن له مێژووی دەوڵەتی ماد و ناوچەکەدا تۆمار بکات، به لەناوبردنی دەوڵەتی ئاشوورییەکان. هوخشتره سنوری وڵاتەکەی له هەموو لایەکەوه فراوان کردووه.

لێکۆڵێنەوه شوێنەوارناسییەکان دەریانخستووه، که ئەو گۆرەی له ئەشکەوتی (قزقاپان)[1]دایه گۆڕی هوخشترەی پاشای مادەکانه.

ئەشکەوتی قزقاپان



١. قزقاپان: وشەیەکی تورکییه، واتا (کچ ڕفێن).

## چوارەم: ئاشداهاک یان ئاژدهاک (٥٨٥-٥٥٠پ.ز)

ئەو پاشایە لەلایەن بابلییەکانەوە بە (ئیختۆ ویگۆ)، لای فارسەکان بە (ئاژدیهاک) و لای عەرەبەکانیش بە (زوحاک) ناسراوە. هیرۆدۆتیش بە (ئاستیاگس) ناوی بردووە. ئاشداهاک لە دوای مردنی باوکی، بووە بە جێنشین، وەکو چوارەم پاشای مادەکان، لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دانیشتووە، بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتی پان و پۆڕی ماد. ئاشداهاک هەر لە سەرەتاوە کەسانێکی زۆری لە دەووری خۆی کۆکردۆتەوە، هەموو کاتێکیش خۆی بە زومرد و کانزای گران بەها ڕازاندۆتەوە. بەپێیی مێژووەکەی هیرۆدۆت، ئاشداهاک پاشا کوڕی نەبووە. بۆیە لە ناو خزم و دەست و پێوەندەکانی پاشادا، قسە لەسەر ئەوە کراوە، کە دەبێت دوای مردنی پاشا کێ جێگەی بگرێتەوە؟ لەسەرەتای فەرمانڕەوایەتی ئاشداهاکدا، لە ناوچەکانی باشووری وڵاتەکەی، واتە، لە نزیک لێوارەکانی باکوور و خۆرهەڵاتی کەنداوی (فارس — عەرەب)، دوو میرنشینی فارسە (ئەخمینیی - هەخامەنشییەکان) سەریان هەڵداوە.

ئەوانیش میرنشینی (ئەنشان)، لە ناوچەکانی خوزستانی ئێستا و میرنشینی (پارس)، لە ناوچەکانی فارسی ئێستای ئێران بوون. میر (کامبیز) ناوێک ئەو کاتە فەرمانڕەوای ناوچەی ئەنشانی کردووە، کە لەهەمانکاتدا، هەر دوو میرنشینەکە لە ژێر فەرمانڕەوا و دەسەڵاتی پاشای ماد بوون.

ئاشداهاک لە تەمەنی (١٠) دە ساڵی فەرمانڕەوایی خۆیدا، شەوێک خەوێکی ترسناکی بینیوە، کە خەونەکەی بەو شێوەیە بووە: (ئاو داویەتی بە سەر شارەکەی ئەواندا و لافاو هەموو ناوچەکەی داگیرکردووە). ئاشداهاک ئەو کاتە بڕوای تەواوی بە خەون لێکدەرەوە موغەکان هەبووە، هەر بۆیە زوو خەونەکەی بۆ گێڕاونەتەوە. ئەوانیش لە وەڵامدا، پێیان گوتووە، کە لە داهاتوودا، نەوەیەکی پاشا دەسەڵات لە دەست ئاشداهاک دەردەهێنێت. ئاشداهاک هەر، کە گوێیی لە وەڵامی خەونەکەی بووە، کەوتۆتە ترس و لەرزەوە و بە تەواوی ترس باڵی بەسەرداکێشاوە. لەوکاتەدا،

ئاشداهاک تەنها (ماندانە)ی دووەم کچی ماوە، کە شووی نەکردووە، هەر بۆیە بڕیاریداوە، کە نەیدات بە هیچ کەسێک لە مادەکان و بە تایبەت لە خزمەکانی خۆی، بەڵکو بیداتە کەسێک، کە لە مادەکان نەبێت، بۆ ئەوەی نەوەکەی مافی شوێنگرتنەوەی ئەوی نەبێت و لێکدانەوەی خەونەکەی بەتاڵ ببێتەوە. ئاشداهاک بڕیاریداوە کچەکەی بدات بە کەسێک، لە ڕەگەزی پارسەکان، چونکە لەوسەردەمەدا، دەسەڵات بۆ پارسەکان ڕەوا نەبووە. بۆ ئەو مەبەستە، میر کامبیزی میری ئەنشان باشترین و شیاوترین کەسێک بووە، کە شایەنی ئەوە بێت، پاشا کچەکەی خۆی بداتێ، چونکە ئەو لە بنەماڵەیەکی ناسراو و بەناوبانگ هەڵکەوتووە، هەروەها جێگای بڕوا و پشت پێبەستنی ئاشداهاکیش بووە، سەرئەنجام، ماندانە دراوە بە میر کامبیزی ئەخمینی:

دیسان ئاشداهاک لە هەمان ساڵی شوکردنی کچەکەیدا، خەوێکی ناخۆش تری بینیووە، کە ئەو خەونەشی بەو شێوەیە بووە: (لە ناو سکی کچەکەیدا، دارمێوێک ڕواوە، بە شێوەیەک لە گەشەکردندا بووە، کە خەریک بووە هەموو ناوچەکە داگیربکات). کاتێک خەونەکەی لەلای خەون لێکدەرەوەکان گێڕاوەتەوە، لە ئەنجامی خەونەکەی ئاگاداربووەتەوە، کە زنجیرەیەک ڕۆژگاری سەخت و شومی بەسەردادێت. بۆیە ئاشداهاک فەرمانیداوە کچەکەی، کە دووگیان بووە، لەناوچەی پارسەکانەوە بهێنرێتەوە بۆ ئەکباتان. کاتێک ماندانە هێنراوەتەوە بۆ لای پاشا ئاشداهاک، بەوردی خستویەتیە ژێر چاوەدێری خۆیەوە، بۆ ئەوەی ئەو منداڵەی لەدایک دەبێت، یەکسەر بیکوژێت، چونکە خەونلێکدەرەوە موغەکان، وەها خەونەکەیان بۆ لێکدابوەوە، گەیشتبووە ئەو ئەنجامەی، کە ئەو کچەزایەی لە سکی ماندانە دایە، ڕۆژگارێک دێت هەموو سەرزەمیینی ئاسیا داگیر بکات و مادەکانیش بکاتە کۆیلە. ئاشداهاکیش بەهیچ شێوەیەک ئارەزوومەند نەبووە، کە ئەوە ڕووبدات و خەونەکەی ببێتەڕاستی، بۆیە دوای لەدایکبوونی منداڵەکە، ئاشداهاک بەپەلە داوای بینینی (هارپاک)ی سەرلەشکری کردووە، کە ناوبراو یەکێک بووە لە خزمە نزیکەکانی

خۆی، به ئەمەکترین و باوەڕپێکراوترین کەسی مادیش بووە، بەرامبەر به پاشا، هارپاک کاروباری نهێنیی و تایبەتی پاشای ئەنجام داوه . دوای گەیشتنی هارپاک بە کۆشکی ئاشداهاک، بەوجۆره لەگەڵی کەوتۆته قسەکردن: (هارپاک کارێک من کە بە تۆی دەسپێرم، بەکارێکی لاوەکی و سادە و ساناو بێ بایەخ، تەماشای مەکە، هەروەها منیش بەرامبەر بەخۆت بەدبین مەکە . ئەو منداڵەی کە ماندانە هێناویەته ژیانەوە، هەڵیبگرە و بیبەرەوە بۆ ماڵی خۆتان، بیکوژە و بیسپێرە بەخاک. بەهەر شێوەیەک، کە خۆت بەباشی دەزانیت).

هاپاکیش لە وڵامی ئەو فەرمانە سەیر و سەمەرەیەدا گوتوویەتی: (جەنابی پاشا، تا ئێستا هیچ کاتێک لەلایەن منەوە، کارێکت نەدیتووە، کە به پێچەوانەی ئارەزو و خواستی بەڕێزتانەوە بووبێت، من بۆ ئەوە و لەوەو دواش هەر ئاوا دەمێنمەوە و نامەوێت بەهیچ جۆرێک هەڵەی ئاوا بکەم، کە بە پێچەوانەی ئارەزووی تۆوەبێت. ئەگەر ئارەزووی تۆ وەهابێت و لەسەر ئەوە سووربیت، کە ئەو کارە پێویستە بەوشێوەیە ئەنجام بدرێت، دەبێت منیش بەئەمەک بم و بەتەواوی فەرمانی بەڕێزتان جێبەجێ بکەم).

دوای ئەوەی منداڵەکە بۆ کوشتن ساز و ئامادەکراوە، براوە بۆ ماڵی هارپاک، دواتر هارپاک به دەم گریانەوە مەسەلەکەی بۆ هاوسەرەکەی گێڕاوەتەوە . لە وەڵامدا، هاوسەرەکەی پێیی گوتووە: (چۆن بیری لێدەکەیتەوە؟ چۆن بڕیارتداوە؟ دەتەوێت چی بکەیت؟).

هارپاکیش لە وەڵامی هاوسەرەکەیدا گوتوویەتی: (نەخێر بەوشێوەیە بیرم نەکردۆتەوە، کە ئاشداهاک فەرمانیداوە، ئەگەر فکر و بیری لەوە بەد تریش لە مێشکیدا سوڕ بخوات و لەوەش توندڕەو تربێت، کە خۆی باسیکرد، من بەخواست و ئارەزووی ئەو ناجوڵێمەوە، دەستی یارمەتیش بۆ کەس درێژناکەم، کە ئەو منداڵە بکوژێت، چونکە ئەو منداڵە لەسەرێکەوە خزمی منە و لەلایەکی تریشەوە، ئاشداهاک پیربووە و منداڵێکی نێرینەی نییە، کە ببێت بە جێنشینی ئەو، بەو هەلومەرجەی

که کوڕی نییە ببێت بە جێنشینی، ئەوا کچەکەی شوێنی دەگرێتەوە، دوای ئەوەش کە کچەکەی بوو بە جێنشینی و جڵەوی دەسەڵاتی کەوتە دەست، ئەو کچەی کە هەنوکە کوڕەکەی بە یارمەتی من سەری تیا بچێت، بێگومان ئەوە دەبێت بە گەورەترین مەترسی، کە یەخەی من دەگرێت. باشە لای تۆش وەها نییە؟ دیارە بۆ سەلامەتی من، دەبێت ئەو منداڵە بکوژرێت، بەڵام نەک بەهۆی منەوە).

هارپاک لە بیری ئەوەدا بووە، کە ئەو کوشتنە بەهیچ جۆرێک پەیوەندی بە ئەوەوە نەبێت و دەستی ئەو بە خوێنی منداڵی ماندانە سوور نەبێت. ئەو بیری لە تەگبیرێک کردۆتەوە، کە پێویستە یەکێکی لەبار بۆ ئەو کارە مەترسیدارە بدۆزێتەوە، لەلایەکی تریشەوە هارپاک لە مەترسییەکی دیکە بیری کردۆتەوە، کە ئەویش نەبوونی جێنشینێکی نێرینە بووە بۆ ئاشداهاک.

هیرۆدۆت بەڕوونی ترسی هارپاکی لەوکارە ئاشکراکردووە: (ئەو مەترسییەی لە داهاتوودا لەوانەیە ڕووبەڕووی هارپاک ببێتەوە، ئەوەیە کە بەرپرسیاربوونی ئەوە لەو مەسەلەیە، کە ئەگەر بێتوو ماندانەی کچی ئاشداهاک، لەداهاتوودا لەجێگای باوکیدا بچێتە سەرتەختی فەرمانڕەوایەتی، ئەو کاتە ماندانە کەسێک دەبێت، کە منداڵەکەی بەهۆی هارپاکەوە یان بە هاوکاری ئەو لەناو چووە، بێگومان ئەو کاتە گەورەترین مەترسی ڕوودەکاتە هارپاک. دیسان ئاشکرایە پاشا ئەو کارەی بەڕاستی خستۆتە ئەستۆی هارپاک و هیچ ڕێبازێکیش بۆ دەرباز بوون لەژێر ئەو بارە قورسە نییە. بۆیە لەلایەکەوە بۆ سەلامەتی خۆی، دەبوایە ئەو منداڵە بکوژێت، بەڵام نەک بەهۆی ئەوەوە. ئەو بۆ یەکێک گەڕاوە، کە بەهیچ جۆرێک لە ئەوەوە نزیک نەبێت).

هیرۆدۆت نووسیویەتی: ئاشداهاک چاوەڕوان بووە، کە ئەو کارە بە دروستی و بە وردی لە لایەن هارپاکەوە ئەنجام بدرێت. هارپاکیش توانای پرکێشی سەرپێچی فەرمانی پاشای لەخۆیدا نەبینیووە و نەشی ویستووە بەهیچ جۆرێک ئەو کوشتنە بەهۆی ئەوەوە یان بەهاوکاری ئەو ئەنجام بدرێت. بەڵکو ویستوویەتی بەدەستی یەکێک لە دەورووبەر و خزمەکانی پاشا ئەو کارە بکرێت. دواتر هارپاک بانگی شوانە

تایبەتییەکەی پاشای کردووە، کە ناوی (مەرد و ئەترادات) بووە، لە گوندێکی نزیک ئەکباتان مێگەلەکەی پاشای پەروەردەکردووە، دوای ئەوەی هارپاک بانگی مەرد و ئەتراداتی کردووە، پێیی گوتووە: (پاشا منی ڕاسپاردووە، کە بەتۆ بڵێم: ئەگەر ئەو منداڵە نەکوژیت، خۆت لەشوێنی ئەو بەخراپترین شێوە دەکوژرێیت).

کاتێک شوانەکە گوێبیستی ئەو فەرمانە بووە، خۆی بە ملکەچی جێبەجێکردنی کارەکە داناوە. بەڕێکەوت هاوسەری شوانەکە دووگیان بووە، لە چاوەڕوانی بوونی منداڵەکەیدابووە، هەر ئەو ڕۆژە هاوسەرەکەی منداڵەکەی بە مردویی بووە. بەپێیی پەرتوکەکەی هیرۆدۆت، کاتێک مەرد و ئەترادات چووە بۆ ماڵی هارپاک، بۆ وەرگرتنی منداڵەکە، دوای گەڕانەوەی شوانەکە بۆ ماڵەوە هاوسەرەکەی لێیی پرسیووە، کە هارپاک بۆچی دوایکردووە؟ ئەویش لەوەڵامدا گوتوویەتی: (کاتێک گەیشتمە شار، ئەوەی بینیم و ئەوەی بیستم، سەد بریا بمردمایە. ماڵی هارپاک پڕبوو لە خەڵک، زۆر بەناڕەحەت چوومە ژوورەوە، لە ژوورەوە کۆرپەلەیەکی شیرەخۆرەم بینی، کە دەگریا، بە جوانترین پۆشاک ڕازێنرابۆوە. هارپاک فەرمانی پێکرم، کە دەبێت ئەو منداڵە هەڵبگرم، بیبەم لە شوێنێک، کە دڕندەی زۆری لێبێت، لەسەر شاخێکی بەرز فڕێیی بدەمە خوارەوە، بۆ ئەوەی بمرێت. منیش کۆرپەکەم هەڵگرت و لەگەڵ خۆم هێنامەوە، لەو بڕوایەدابووم، کە منداڵەکە ئەندامێکی سەر بەخێزانی خودی هارپاکە. بەهۆیەکەوە، کە من نازانم چییە، دەیانەوێت لەناوی بەرن، بەڵام لە ڕێگا زانیم کە کچەزای خودی پاشای خۆمانە).

بەپێیی هیرۆدۆت، منداڵەکە زۆر جوانبووە، بۆیە هاوسەری شوانەکە دەستیکردووە بە گریان و گوتوویەتی: «ئێمە بێ منداڵین، لەدوا ڕۆژدا، کە پیر بووین کەس نییە بژێویمان بۆ پەیدابکات و لەبرسان دەمرین، بۆیە نابێت ئەو کوڕە بکوژیت. من بەخێوی دەکەم، چونکە دەزانی دوای لەناوبردنی ئەو کۆرپەلەیە، چەند خەمبار و پەرێشان دەبین».

هەر بۆیە هاوسەری شوانەکە تکای لە مێردەکەی کردووە، کە منداڵەکە نەکوژێت،

بەڵام شوانەکە ئامادە نەبووە قسەی هاوسەرەکەی پەسەند بکات، چونکە لەوبڕوایە دابووە، کە لەوانەیە هارپاک سیخوڕی بەدوادا ناردبێت، تا بزانێت چۆن فەرمانی ئەو جێبەجێ دەکات. کاتێک ژنەکە دڵنیابووە لەوەی، کە تکاکردن و پاڕانەوە هیچ کەڵکێکی نییە، بۆیە گوتوویەتی: (ئێستا کە هەر دەتەوێت منداڵەکە لەناوبەریت، ئەوەی کە من پێت دەڵێم ئاوابکە، دوای تۆ کۆرپەکەم بەمردوویی بووە، تۆ لەجێگای ئەو منداڵە زیندوە، منداڵە مردوەکەی خۆمان هەڵبگرە و لە شوێنێک کە دڕندەی زۆرە بەجێیی بهێڵە، ئیتر دەتوانین ئەو کچەزایەی پاشا لەجێگای منداڵەکەی خۆمان پەروەردە بکەین).

ئینجا دەستبەجێ شوانەکە قسەی هاوسەرەکەی پەسەند کردووە، منداڵەکەی داوەتە دەستی ژنەکەی، منداڵە مردوەکەشی هەڵگرتووە، هەموو جلوبەرگ و پۆشاکە جوانەکانی کوڕی ماندانەی لەبەرکردووە، بردویەتی لە شاخێکی بەرزدا، فرێیی داوەتە خوارەوە. دواتر شوانەکە جلە خوێناویەکانی بۆ هارپاک هێناوەتەوە. ئەویش بۆ دڵنیابوونی پاشا لە کارەکەی، جلە دڕاو و خوێنیینەکانی منداڵەکەی بردوەتەوە بەردەمی پاشا.

لە هەمان کاتدا، خانەوادەی شوانە خزمەتکار و میهرەبانەکە بێئاگابوون لەوەی، کە ئەو منداڵەی ئەوان بەخێوی دەکەن، هەمان ئەو (کۆرش)ەیە، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەبێتە کەسێکی گەورە و بەناوبانگ و دەبێتە هۆی لەناوبردن و کۆتایی پێهێنانی دەسەڵاتی ئاشداهاک پاشای مادەکان.

کۆرش هەتا تەمەنی (١٠) ساڵی لەلایەن ئەو زڕدایک و باوکە شوانەوە پەروەردەکراوە، هیرۆدۆت نوسیوویەتی: ڕۆژێکیان کۆرش لە دەورووبەری گوندەکەیان لەگەڵ منداڵانی ئاواییدا گەمەی کردووە، لەلایەن هەمووانەوە بە پاشا هەڵبژێردراوە، بەڵام ڕوداوێک ڕویداوە، کە هیچ کەسێک پێشبینی نەکردووە، لەوکاتەدا، کۆرش بەپێیی دەستوور و یاسایی یارییەکە، چەند منداڵێکی وەک پاسەوان و خزمەتکاری خۆی دیاریکردووە. هەر کەسەو ئەرکی خۆی دیاربووە، هەموان ملکەچی فەرمانەکانی

کۆرش بوون، بەڵام یەکێک لەو منداڵانەی کە بەشداری یارییەکە بووە، کوڕی نەجیبزادەیەکی مادەکان بووە، بەناوی (ئارتیماس). منداڵەکە چونکە کوڕی خانەدان و گەورە پیاوێکی پاشا بووە، بەلایەوە شورەیی بووە، کە ملکەچی فەرمانەکانی کۆرش ببێت، جەسارەتیکردووە و یاسای یارییەکەی شکاندوە، لەئەنجامی ئەوکارەدا، کۆرش زیندانی کردووە و بەپێیی بنەما و بڕیارەکان، لە دەرباری کۆرشدا دارکاری کراوە. کوڕەکەش دوای ئازادکردنی توڕە و ناڕەحەت بووە، چونکە ئەو ڕەفتارە نابەجێ و ناشایستەیەیان لەگەڵ کوڕی نەجیبزادەیەکدا کردووە. لەبەرئەوە چووە لەلای باوکی سکاڵای کردووە، ئارتیماسیش کە هەستی بە سوکایەتی و خەجاڵەتی کردووە لەلای پاشای گەورە سکاڵای دەربڕیووە و ڕوداوەکەی بۆ گێڕاوەتەوە، کە بێڕێزی بەرامبەر بەچینی نەجیبزادەکان کراوە، شکۆمەندیان لەکەدار کراوە. هەر ئەو کاتە ئاشداهاک داوای کۆرش و باوکی کردووە، بۆ دەرباری پاشایەتی و بەزمانێکی ڕەق و توند سەرکۆنەیکردون، بە کۆرشی گوتووە: (تۆیی کوڕە شوان، چۆن وێراوتە دەستدرێژی بکەیتە سەر کوڕی یەکێک لە نەجیبزادە پلە یەکەکانی دەرباری من).

کۆرشیش لە وڵامدا گوتوویەتی: (پاشای گەورە من کە کارێکی لەوجۆرەم کردووە، ڕەفتارەکەم دروستە، یەکانگیری یەکسانی و دادپەروەری بووە، منداڵانی گوند لە یارییەکەدا منیان بە پاشای خۆیان هەڵبژاردوە، چونکە لە دیدی ئەوانەوە من لە هەمووان شایستە تر و شیاو تر بووم. لەگەڵ ئەوەشدا، هەموو منداڵەکان فەرمانەکانی منیان جێبەجێ کردووە، تەنها ئەو نەبێت، کە ملکەچم نەبووە).

لەوکاتەدا، کە کۆرش قسەکانی خۆیکردووە، ئاشداهاک بەسەرنجەوە سەیری قسە و شێوە و ڕەفتارەکانی کردووە، گومانێکی لە کوڕەکە کردووە، چونکە هەموو شێوەی کوڕە شوانەکە زۆر بەشێوە و ڕوخساری خۆی چووە. بەپێیی نووسراوەکەی هیرۆدۆت، دواتر پاشا سکاڵاکار و کوڕەکەی بەڕێکردووە و شوانەکەی بانگکردووەتە لای خۆی. داوای ڕونکردنەوەی لێکردووە، سەبارەت بەو لاوەی، کە دەڵێت کوڕیەتی، لەوکاتەدا، شوانەکە ڕەنگی گۆڕاوە و زمانی دەستیکردووە بە تەتەڵەکردن، چەند

وشەیەکی نارێکوپێکی درکاندوە، بەڵام پاشا هەرەشەی لێکردووە، کە ئەگەر ڕاستی پێنەڵێت، هەرلەوێدا بەزیندویی پێستی دەگروون. دواتر شوانەکە ڕوداوەکەی بەوجۆرەی کە ڕویداوە بۆ پاشا گێڕاوەتەوە. دوای ئەوە دەمودەست هارپاک بۆ لای پاشا هێنراوە، ئەویش گوتەکانی شوانەکەی پشتڕاست کردۆتەوە. لەوکاتەدا، ئاشداهاک لەناخی خۆیدا، دەربارەی ئەو ڕوداوە، هەستی بە نهێنی و ویستی خواکان کردووە، بۆیە بڕیاریداوە، کە نابێت هەرگیز خۆی بخاتە بەرمەترسی و ڕکوکینە و تورەیی خواکان. جارێکی تر داوای موغەکان و خەون لێکدەرەوەکانی کردووە، کەوتوەتە گفتوگۆکردن لەگەڵیاندا، کە دەبێت چی بکەن؟ ئەوانیش ئەنجومەنێکیان بۆ لێکدانەوەی ئەو ڕوداوە پێکهێناوە، ماوەیەک لەو بارەیەوە ڕاوێژیانکردووە، هەتا دواجار گەیشتوونەتە ڕایەک و بەوجۆرەی خوارەوە ڕای خۆیان بە پاشا ڕاگەیاندوە: (لەگەڵ ئەوەی، کە ئەو لاوە پێشتر لەلایەن پاشاوە، فەرمانی کوشتنی بۆ دەرکراوە، کەچی هێشتا هەر زیندووە، بەوەدا دەردەکەوێت، کە خواوەندەکان پارێزەر و پشتیوانی ئەو بوون، لەگەڵ ئەوەشدا، دەبێت هەموو جۆرە بەدگومانی و نیگەرانییەک لەدڵت لابدەیت، چونکە ئەو لاوە لەنێو هاوتەمەنەکانی خۆیدا بووە بە پاشا و بەوجۆرەش خەونەکەت هاتۆتەدی، چیتر دووبارە نابێتەوە، ئەو ڕووداوە کۆتایی خەونەکەیە. دووبارەی دەکەینەوە، کە خەونەکە بەدیهاتووە، بەو واتایەی لە بنەچەی تۆ، کوڕێک هاتۆتە دنیاوە، بووە بە پاشا، ئیتر پێویست ناکات سڵ لەو کوڕە بکەیتەوە، چونکە ئەو لە نەتەوەی پارسیشە و گوێزانەوەی فەرمانڕەوایی لە مادەکانەوە ڕەوا نییە بۆ ئەوان. ئەوەندە هەیە بۆ ناوچەکەی خۆی و بۆ پارس بینێرەوە).

زیرەکی و لێوەشاوەیی موغەکان بەوجۆرە بووە، کە لە لێکدانەوەی خەونەکاندا، زۆر شارەزا بوون و لەوکاتەشدا، بڕوایان بە ئاشداهاک هێناوە، سەبارەت بە ئەو ڕوداوە. ئینجا کۆرش نێردراوەتەوە بۆ پارس، بۆ لای دایک و باوکی ڕاستەقینەی خۆی.

هەرچی چارەنوسی هارپاکیشە، کە ڕێکەوت وایکردووە، ڕۆڵێکی گرنگی هەبێت لە ژیانی کۆرشدا، ئەوەی لە یادنەبووە، کە ئاشداهاک پاشا بۆ سزادانی ئەو، لە ئەنجامی نافەرمانیکردنیدا، لە بەرامبەر کوشتنی کۆرش فەرمانی کوشتنی کوڕەگچکەکەی دەردەکات. لەوبارەیەوە هیرۆدۆت ڕوداوێکی زۆر خەماوی گێڕاوەتەوە:

کوڕە گچکەکەی هارپاک، بە فەرمانی خودی ئاشداهاک کوژراوەتەوە، لە مەنجەڵێکی گەورەدا، لەلایەن چێشتلێنەری تایبەتی پاشاوە کوڵێنراوە، خواردنێکی باشی لێ ئامادە کراوە، لە خوانێکی شاهانەدا، سفرەی پێ ڕازێنراوەتەوە، ئینجا پاشا هارپاکی بانگهێشتی ئەو میوانداربیە کردووە. دوای خواردنی گۆشتی کوڕەکەی، پاشا لە هارپاکی پرسیووە: ئایا چێژی خواردنەکەی بەلاوە بەتام بووە و بە دڵی بوو؟ وەڵامی هارپاکیش ئەوە بووە، کە هەرگیز لە کۆشکدا میوانداری لەو جۆرە و خواردنی هێندە بەلەزەتی نەخواردوە. ئینجا ئاشداهاک سەری بڕدراوی کوڕەکەی هارپاک، کە لەناو سەبەتەیەکدا بووە، نیشانی هارپاکیداوە و پێیی ڕاگەیاندوە، کە ئەو خواردنە خۆشە، بە گۆشتی کوڕەکەی ئەو سازکراوە، لە ئەنجامی نافەرمانیکردنیدا لە بەرامبەر پاشا. هارپاکیش لەگەڵ بیستنی ئەو هەواڵە دڵ تەزێن و جەرگ بڕەدا بەئارامی و بەسەبرێکی توندەوە ڕوکەشانە دانی بەدڵی خۆیدا گرتووە، لەهەمانکاتیشدا، ئارەزووی تۆڵە سەندنەوەی لە ئاشداهاک لەدڵیدا چاندوە، لەوکاتەشدا، ئەوەشی لەخەیاڵ و لە دڵدا نەبووە، کە خودی خۆی لەگەڵ پاشادا ڕووبەڕوو ببێتەوە، چونکە زانیوویەتی کە ئاشداهاک بەبێ دادگایکردن لەناوی دەبات. لەبەر ئەوە وای بەباش زانیوە، کە ئەو ڕووداوە، بداتە دەست خواکان، چونکە هەر ئەوان دەتوانن هۆکارێک بۆ سزادانی ئەو پاشا زۆردارە بڕەخسێنن. هارپاک لە چاوەڕوانی بەدەستهێنانی هەلێکی گونجاودا بووە، کە لە ژێر خۆشڕویی و خەندەدا توڕەیی و بێزاریی خۆی بە ئاشداهاک برێژێت، هەردەم تێکۆشاوە و بڕوا و متمانەی ئاشداهاکی بەرامبەر بە خۆی لەق نەکردووە، هیچ کاتێک لە پێشکەشکردنی دیاری بە پاشا درێخی نەکردووە.

## شەڕی پاشای ماد و کۆرشی هەخامەنشیی

دوای ماوەی چەند ساڵێک، هەندێک پشێوی و نا ئارامی لە ئەکباتانی پایتەخت ڕویداوە، بەهۆی ئەوەی، کە ئەشداهاکی پاشای ماد لەبەر ڕابواردن و خۆشگوزەرانی خۆی ئاگای لە بەڕێوەبردنی وڵات نەماوە. بەو مەبەستە هارپاکیش ئەوەی بە هەل زانیووە، لەناو دەرباری ئەکباتاندا، دەستیداوەتە ئاژاوە و پشێوی نانەوە، چونکە لەوکاتەشدا، ئاشداهاک وردە وردە خەریکی لەدەستدانی جڵەوی دەسەڵاتی بووە، هەتا کار گەیشتۆتە ئەوەی، کە فیداکارترین خزمەتکارەکانیشی ئەو بوێرییەیان هەبووە، کە ڕەخنە لە سستی و نەشارەزایی ئەو بگرن، لە بەڕێوەبردنی دەسەڵاتدا. لەوکاتەدا، هارپاک ماوەیەکی زۆر خۆی هیلاک کردووە، هەتا بتوانێت لەناو دەرباری پاشادا، هاوەڵی بەهۆش و تێگەیشتوو بدۆزێتەوە و پەیدا بکات. هارپاک دوای ئەوەی ڕاز و مەبەستەکانی خۆی، بۆ هاوەڵە نزیکەکانی باسکردووە، کە بڕیاریداوە، هەنگاو بنێت فەرمانڕەوایی ئەکباتان لەناوبەرێت. پرسێکی لە هەمووشی گرنگتر ئەوە بووە، کە کەسێکی گونجاو بۆ سەرکردایەتیکردنی ئەو پیلانە پەیدابکات.

لەولاشەوە کۆرش لە ساڵی (٥٥٩ پ.ز) دەسەڵات و فەرمانڕەوایی میرنشینی ئەنشانی گرتۆتە دەست. دواتر و دوای ئەوەی، کە کۆرش بە ڕووداوی ڕابردوی خۆی زانیووە، کەوتۆتە بیرکردنەوە بۆ تۆڵەسەندنەوە لە ئاشداهاک. بە بڕوای هارپاک کۆرش ئەو کەسە گونجاوە بووە، کە ئەو بیری لێکردۆتەوە، بۆیە هەر زوو لە نەخشەکەی خۆی ئاگاداری کردۆتەوە و داوای لێکردووە، کە لە باپیری خۆی، واتە، پاشای ماد هەڵبگەڕێتەوە و پشتیوانی لە هارپاک بکات، هەروەها لەگەڵ ئەواندا، پەلاماری ئەکباتانی پایتەخت بدات، بۆ ئەوەی دەسەڵات لە دەست پاشا دەربهێنن. بەوجۆرە کەسێکی جێگا بڕوای خۆی بەو پەیامەوە بۆ لای کۆرش ڕەوانەکردووە:

(ئەی کوڕی کامبیز، بێگومان خواوەندەکان دەستی پارێزگارییان بە تۆوەیە. ئەگەر وانەبوایە ئێستا زیندو نەدەبوویت، وەرە و تۆڵەی خۆت لە پاشای ماد بکەوە، کە هەر پاش لەدایکبوونت، دەیویست لەناوت بەرێت. ئەگەر تۆ ئامادەبیت، گوێ بۆ

قسەکانم ڕادێریت، دەتوانیت ببیتە دەسەڵاتداری ئەو وڵاتەی، کە ئێستا ئاشداهاک پاشایەتی، پارسەکان بە ئاسانی هەست بە ئەوە دەکەن، کە تۆ تەنیا ئومێدی سەرفرازی و ئازادی و ڕووی هێز و مەزنایەتی ئەوانی. ئەوان لەسەر داوای تۆ دەست دەدەنە یاخیبوون و تۆش بەهاوەڵی ئەوان و بەکۆمەکی ئەو لایەنگرانەی خۆم، کە لەنێوان مادەکاندا ئامادەیان دەکەم، بە ئاسانی دەتوانیت دژ بەو ئاشداهاکە خراپکارەی دوژمنی هاوبەشمان بەشەڕ بێیت. ئەگەر من لەلایەن خودی پاشاوە وەک سەرلەشکر هەڵبژێردرێم، هەتا ڕووبەڕووی تۆ ببمەوە، ئەوا یەکەمین کەس دەبم، لەشکر و وڵات ڕادەستی تۆ دەکەم. خۆ ئەگەر کەسێکی تر لە ناوداران بکرێتە سەرلەشکر، ئەوا ئەویش بەهەمانشێوە ڕەفتار دەنوێنێت، چونکە ئەوانیش چاوەڕێیی تاکە ئاماژەیەکن لەمنەوە، هەتا لە پاشاکەیان جیا ببنەوە و ببنە لایەنگری تۆ، لە ئەکباتان هەمووشتێک ئامادە کراوە، لەکۆتاییدا، هیوادارم چیم پێڕاگەیاندوی بەوجۆرە بکەی).

کاتێک کۆرش ئەو پەیامەی پێگەیشتووە، کە داوای یاخیبوونی لێکردووە، دژ بە دەسەڵاتی یاسایی پاشا، لەهەمانکاتیشدا، کۆرش لە هەلێکی ئاواگەڕاوە، بۆ تۆڵە کردنەوە. کەوتۆتە بیرکردنەوە، لە دابینکردنی ئەو هۆکارانەی، کە سەرکەوتنی لەو کارە پڕ مەترسییەدا بۆ دەسەبەر دەکەن. هەر زوو بانگهێشتی سەرانی هۆزەکانی پارسی کردووە و لەگەڵیاندا کۆبووەتەوە. سەرئەنجام کۆرش بە هێزێکی زۆرەوە، لە باشوورەوە بەرەو ئەکباتانی پایتەختی ماد کەوتۆتەڕێ[1].

لە ساڵی (٥٥٤پ.ز)، شەڕ لەنێوان مادەکان و پارسەکاندا، بەسەرکردایەتی کۆرش دەستیپێکردووە، کە ئەو شەڕە (٤) چوار ساڵی خایاندوە، هارپاکیش بۆ شەڕەکە، لەلایەن پاشای مادەوە کراوە بە سەرلەشکری مادەکان.

١. ئانگارێس: بەیت بێژی مادەکان بووە. کاتێك کۆرشی هەخامەنشیی ویستویەتی هێرش بکاتە سەر ئەکباتان ئەو لە دیوەخان و بارەگای ئاشداهاکدا بووە و بە بەیت هێرشی کۆرشی بۆسەر ئەو ئاشکرا کردووە.

بەپێیی هیرۆدۆت، دوو شەڕ لە نێوان مادەکان و پارسەکاندا ڕوویداوە، کە لەشەڕی یەکەمدا، خودی ئاشداهاک ئامادە نەبووە و سەرداری شەڕەکە هارپاک بووە،

هارپاکیش بەو شێوەیەی، کە بەڵێنی بە کۆرش داوە، لەگەڵ سوپاکەیدا مەیدانی شەڕەکەی بەجێهێشتووە و هەڵاتووە، بەڵام لەشەڕی دووەمدا ئاشداهاک خۆی فەرماندەی ئەو مادانەی کردووە، کە هێشتا وەفا داربوون بەرامبەری، بەڵام لەئەنجامی ئەوشەڕەشدا، مادەکان شکستییان هێناوە، چونکە زوربەی سەربازەکان لە دژی پاشا هەڵگەڕاونەتەوە.

لە ئەنجامی ئەو شکستەی مادەکاندا، سەرئەنجام ئاشداهاک ڕایکردووە بۆ ئەکباتانی پایتەخت، لەوێ خۆی حەشارداوە. کاتێک کە ساڵی (٥٥٠پ.ز) لەشکری کۆرش گەیشتونەتە ئەکباتان، دوای گەمارۆیەکی دوور و درێژی پایتەخت، ئینجا کۆرش و ڕاپەڕیوان توانیویانە بەسەر شوورەکانی ئەکباتاندا سەربکەون و پایتەختی مادەکانیان داگیر کردووە، دواتر ئاشداهاک لەبەر سەلامەتی گیانی (ئامیتیدا) ی کچی و زاواکەی (ئاسپیتام) و منداڵەکانیان خۆیداوە بە دەستەوە[1].

لەوکاتەدا، هاتنە سەرتەختی پاشا وا باوبووە، کە ئەگەر هاتوو پاشا مرد و کوڕی نەبوو تەخت و دەسەڵاتی پاشا بەپێیی یاسا گوێزراوەتەوە بۆ کچەزا یان زاواکەی. ئاسپیتام کە زاوای ئاشداهاک بووە، کۆرش دوای داگیرکردنی ئەکباتان کوشتوویەتی و ژنەکەی، واتە ئامیتیدا، کە لەهەمانکاتدا، پوریشی بووە، لەخۆی مارە کردووە[2]، چونکە مەبەست لەو کارەی کۆرش ئەوە بووە، کە دەسەڵات و فەرمانڕەوایی وڵاتی

١. ئەو نووسراوە لەگەڵ مێژووەکەی (نەبوونید٥٦٢-٥٣٨پ.ز)ی دوا پاشای بابلییەکانیشدا یەکدەگرێتەوە. کە کاتی خۆی لەسەر نووسراوەی لولەیی تۆماریکردووە و لە (سیپار) دۆزراوەتەوە.
٢. دوای کۆرش ئەو نەریتی مارەکردنی هاوشیرە لەناو پاشایانی هەخامەنشیدا بووە بە باو، چونکە هەریەک لە (کامبیز) ی کوڕی کۆرش خوشکی خۆی مارەکردووە. (داریوشی یەکەم) خوشکەکەی خۆی مارەکردووە، (ئەردەشێری دووەم) کچەکەی خۆی بەناوی (ئاتوسا) مارەکردووە. (داریوشی سێیەم) یش کچێکی لەخۆی مارەکردووە.

مادەکان بە فەرمی بگوازرێتەوە بۆخۆی واتە تازە زاوا[1]

دوای ئەو ڕووداوە کۆرش لە بری ئەو چاکە و سەرکەوتنەدا، هارپارکی کردۆتە فەرماندەیی گشتی سوپاکەی و دوای داگیرکردنی وڵاتی لیدیش لەلایەن کۆرشەوە لە ساڵی (٥٤٦پ.ز)، هارپاک بەفەرمی کراوەتە فەرمانڕەوایی ناوچەکانی لیدی و هەتا مردن لەو پۆستەدا ماوەتەوە. هەروەها (هوخشترەی دووەم) کوڕی ئاشداهاکیش، کە خاڵی کۆرش بووە، کراوەتە فەرمانڕەوا بەسەر ناوچەیەکەوە، لە وڵاتە تازەکەی پاشای پارسەکان. کوڕەکانی ئامیتیدای کچی ئاشداهاکیش، واتە پور و خێزانی کۆرش، بە ناوەکانی (سپیتاک و مهابێرن) هەر یەکەو کراوەتە (ساتراپ)[2]ی ناوچەکانی (هیرکانی و دربیکی). ئەکباتانی پایتەختی پێشووتری پاشای مادیش وەکو جاران بۆ پاشای هەخامەنشیی وەکو پێگە و پایتەخت ماوەتەوە. پاشان سەربازانی بە ڕەگەز ماد چوونەتە ناو سوپای (١٠) دە هەزار کەس لە دەوڵەتی هەخامەنشیی. ئاشداهاکیش دوای (٣٥) ساڵ پاشایەتی وڵاتی مادەکان، بە دیلی هەتا دوارۆژەکانی تەمەنی بە ڕێز و خۆشەویستییەوە لەلای کۆرش ماوەتەوە.

جێگای ئاماژەیە، کە شارەزایان پێیان وایە گۆڕە بەردینەکەی (دوکانداود) گۆڕی ئاشداهاکی دوا پاشای مادەکانە.

تێبینیی: بەشێک لە ژیانی (چوار پاشاکەی ماد)م لە ژمارە (١) ی زستانی (٢٠٠٨) لاپەڕە (٣٢) ی گۆڤاری پشدەردا لەژێر ناوی (دەوڵەتی ماد) بڵاوکردۆتەوە.

١. ئەو نەریتە لەوکاتەدا جگە لە پاشایانی بە ڕەگەز ئاریایی، لە ئاسیای ناوەڕاستیشدا لەلایەن زوربەی پاشا و فەرمانڕەواکانی ئەوسەردەمەوە پەیڕەو کراوە. میسرییەکانیش ئەو نەریتەیان هەبووە. بەوهۆیەوە بووە کە زوربەی پاشاکان لەگەڵ دایك و خوشك و کچەکانیاندا زەماوەندیانکردووە و مارەیانکردون.

٢. ساتراپ: بەوشوێن و ناوچانە گوتراوە کە لەلایەن فەرمانڕەوای وڵاتەوە کەسێکی وەك فەرماندار بۆ دیاریکراوە. کە لەسەردەمی مادەکاندا ئەو یاسایە پەیڕەوکراوە و ئەوان (خشتەرە پێ) یان پێگوتووە.

## ئەشکەوت و گۆڕەبەردینەکانی پاشایانی ماد

لەمەڕ بیناسازی مادەکان، شتێکی ئاوا لەبەردەستی توێژەرەواندا نییە، تەنیا ژمارەیەک گۆڕی لەبەرد دروستکراو نەبێت، کە پەیوەندی بەو سەردەمەوە هەیە، کە دەتوانن بەشێک لە بیناسازی ئەو سەردەمە نیشان بدەن، ئەو گۆڕانە لە ناوەڕاستی شاخ لە بەرد هەڵکەندراون، گۆڕە بەردینەکان لە خانوی نیشتەجێبوون دەچن. ئەو جۆرە خانوانە، لەهاویندا، ڕێگری لە گەرمای خۆر کردووە، لە زستانیشدا، تێپەڕبوونی تیشکی خۆری بۆ ناو خانوەکە ئاسانتر کردووە. ئەو گۆڕانە لە هەیوانێک پێکهاتوون، کە بە کۆڵەکەی بەردینی گەورە ڕاگیرکراون،

زوربەی گۆڕەکان خاوەنی ڕێڕەوی دالآن ئاسان، لە دوو ژووری بچکۆلە یان چەند ژوورێک پێکهاتوون، کە بەشێوەی دوو نهۆم یان لەتەنیشت یەکەوە دروستکراون. ئەو گۆڕانە بۆ ناشتنی یەک هەتا سێ مردو دەستی داوە، هەندێک لەو گۆڕانە چەند تاقێکی قوڵیان تێدایە، بۆ ئەنجامدانی ڕێوڕەسمی قوربانیکردن. لەسەر دەرگای گۆڕەکان چەند هەڵکۆڵینێک لەناو بەردەکاندا بەرچاو دەکەوێت، کە بەتایبەتی بۆ ڕازاندنەوە نەخشێنراون.

### یەکەم: گۆڕە بەردینەکەی (فەخرەقا)

ئەوگۆڕە لە (١٠) دە کیلۆمەتری خۆرهەڵاتی شاری مەهابادی خۆرهەڵاتی کوردستان و لە نزیک گوندی (ئیندرقاش)، لە ناوەڕاستی شاخی فەخرەقادا داتاشراوە. لە بەرهەیوانێک پێکهاتووە، کە بە دوو ستونی لە بەرد دروستکراو ڕاگیرکراوە. ڕێگای چوونە ژوورەی نییە، ئەو ئەشکەوتە (٣) سێ گۆڕی تێدایە، هەریەکەیان بەقوڵی نیو مەتر لە شاخەکە داتاشراون. ئەو گۆڕە بە گۆڕی خشترتیە دووەم پاشای مادەکان زانراوە، کە لە ساڵی (٦٣٣پ.ز)، لە شەڕێکدا لەگەڵ ئاشوورییەکان کوژراوە.

## دووەم: گۆڕ و ئەشکەوتی (قزقاپان)

ئەو گۆڕەش دەکەوێتە نزیک گوندی (زرزی) چەمی ڕێزان، لە ناوچەی ناحیەی (سورداش) ی سەر بە پارێزگای سلێمانی، لە باشووری کوردستان.

ئەو گۆڕە بە بڵندی (١٠) دە مەتر بە شاخێکەوە هەڵکەندراوە، بە پێپیلکەی ئامادەکراو مرۆڤ دەتوانێت بچێتە ناو گۆڕەکە، چونکە پێپیلکەکەی خۆی دوای تەواو بوونی گۆڕەکان تێکدراوە. ئەو شوێنە بەرهەیوانێکی هەیە بە بڵندی (٤) چوار مەتر، لە ناو هەیوانەکە دوو کۆڵەکەی گەورە لە ئەو دیوو و ئەو دیووی دەرگای گۆڕەکان بە شاخەکەوە هەڵکەندراون، لەلای ڕاستی ستونەکان وێنەی خۆرێک دروستکراوە، کە ئەوکاتە هێما بووە بۆ پەرستن، هەروەها لەلای چەپی ستونەکانیش پەیکەرێکی چوار باڵدار نەخشکراوە، لە بنمیچی هەیوانەکەش (٥) پێنج نیرگە بە شاخەکەوە دروستکراون لەگەڵ (٣) سێ ستونی تر بەرەو پێشی هەیوانەکە هەر بە شاخەکەوە هەڵکەنراون. لە ناوەڕاستی هەردوو ستونەکەش لە سەروو دەرگای چوونە ژوورەوەی گۆڕەکان وێنەی دوو پاشا هەڵکەندراوە، پاشای لای ڕاست دەستی ڕاستی خستوەتە سەر شوێنێکی پیرۆز کە لە سەر مێزێکی تایبەت بۆ سوێند خواردن ئامادەکراوە، بە دەستی چەپیشی تیروکەوانەکەی گرتووە. پاشاکەی لای چەپیش دەستی ڕاستی خستوەتە سەر شوێنە پیرۆزەکە بە مەبەستی سوێند خواردن و بە دەستەکەی تریشی تیروکەوانەکەی گرتووە و بەسەر جلوبەرگەکەشیدا بە دەستوری مادەکانی خۆرهەڵات جبەیەکی کردۆتەبەر. بەرزی باڵای پەیکەری ئەو دوو پاشایە (١/٢٥) یەک مەتر و بیست و پێنج سانتیمەترە، لە سەرووی وێنەی ئەوانیشەوە لە ناو بازنەیەکدا وێنەی پاشایەکی تر دروستکراوە، کە زۆر نزیکە وێنەی دیاکۆی یەکەم پاشای مادەکان و باپیرەی هوخشترە سێیەم پاشای مادەکان بێت.

ئەو گۆڕە بەردینە لە هەیوانەکەوە یەک دەرگای هەیە بۆ چوونە ژوورەوە، بەڵام لە ناوەوە لە (٣) سێ ژوور پێکهاتووە، کە هەر ژوورە و دەرگای خۆی بۆ دروستکراوە

و له هەر ژوورەشدا گۆڕێک هەیە کە لە ناوەڕاستی شاخەکە هەڵکەندراون. درێژی هەر ژوورێک نزیکەی (٣) سێ مەتر و پانییەکەشیان نزیکەی (٢/٥) دوو مەتر و نیو دەبێت، هەروەها لەناوەوەش شوێنی داخستنی دەرگای دەرەوەی گۆڕەکان بەشاخەکەوە هەڵکۆڵراوە بۆ پارێزگاریکردن لە تەرمی ناو گۆڕەکان، بەڵام بەداخەوە لەئێستادا گۆڕەکان بەتاڵن و هیچیان تێدانییە. نازانرێت لە چ کات و سەردەمێکدا و لەلایەن کێوە تەرمەکان دەرهاتوون و دزراون. جێگای ئاماژەیە یەکێک لەو سێ گۆڕە بە گۆڕی هوخشترە، سێیەم پاشای مادەکان زانراوە. پێدەچێت وێنەکانیش وێنەی لای ڕاست (ئالیاتیس) ی پاشای لیدییەکان بێت کە لەگەڵ هوخشترە واتا وێنەی لای چەپ خەریکی ڕێوڕەسمی سوێند خواردن بن و پەیمانی ئاشتی مۆر بکەن لە نێوان خۆیاندا لە ساڵی (٥٨٥ پ.ز).



ئەشکەوتی قزقاپان

## سێیەم: گۆڕە بەردینەکەی (دوکانداود)

ئەو گۆڕە دەکەوێتە سەر ڕێگای نێوان شارەکانی (قەسری شرین و کرماشان)، لە باشووری خۆرهەڵاتی کوردستان. لەبەردەم دەروازەی ئەو گۆڕەدا، وێنەی پیاوێکی موغ دەبینرێت، کە کراسێکی درێژی دامێن ئیلامیی لەبەردایە، هەتا قولاپەی پێیی داپۆشیووە، لە دەستی چەپیدا چەپکێک گوڵی بەدەستەوەیە، دەستی ڕاستیشی بەرە و ئاسمان بۆ پەرستن و نزاکردن بەرزکردۆتەوە. لێکۆڵینەوە لە مەڕ ئەو پیاوەی کە وێنەکەی کێشراوە، دەبێت وێنەی موغێکی ئایینی بێت یان نیگاری خودی پیاوە مردوەکەیە. لەوبارەیەوە هەندێک لە توێژەرەوان بۆچوونیان وایە، کە ئەوە نیگاری خودی ئەو کەسەیە، کە لە گۆڕەکەدا نێژراوە. ئێستا گۆڕەکە بە گۆڕی ئاشداهاکی دوا پاشای مادەکان دانراوە.

دەربارەی ئەو گۆڕانە دێرینناسان و توێژەرەوان هاوڕان لەسەر ئەوەی، کە ئەو ئەشکەوتە بەردینانە گۆڕی پاشایانی مادەکانن، چونکە لەیەکچوونی گۆڕەکان و تەنانەت ڕێوڕەسمی مردوناشتنی مادەکانیش، کە بەهۆی نەخشەکێشانی ئەو ئاسەوارە هونەریانەوە بەدیاردەکەون دەتوانرێت ئەو ڕاستییە باشتر پشتڕاست بکاتەوە.

## شاری هەمەدانی ئێستا

ئەو شارە دێرینەی خۆرهەڵاتی کوردستان، ئێستا لە وڵاتی ئێراندا، دەکەوێتە نێوان پارێزگاکانی (زنجان) لە باکوور، سنە و کرماشان لە خۆرئاوا، ناوچەکانی لوڕستان و پارێزگای (خوڕەم ئاباد)، لە باشوور و پارێزگای (قوم) لە خۆرهەڵات. ڕووبەری ئەو شارە (١٩٤٤٥) نۆزدە هەزار و چوارسەد و چل و پێنج کیلۆمەتر چوار گۆشەیە، کە (١٩/١) یەک لەسەر نۆزدەی هەموو خاکی ئێران پێکدێنێت. پارێزگای هەمەدان لە (٨) قەزا و (١٧٧) گوند پێکهاتووە. لە زستاندا، ئاو و هەوای ساردە و ناوچەیەکی کوێستان و شاخاوییە، بە کێوەکانی (ئەڵوەند، خودا بەندەلوو و چلچەشمە) دەور دراوە، چیای ئەڵوەند (٣٨٠٠) مەتر لەسەر ئاستی ڕووی دەریاوە بەرزە، هەر ئەوەش وایکردووە، کە شاری هەمەدان خاوەنی زۆرترین سەرچاوەی ئاو و کانیاو بێت. (سیاڕووت و تیروار) دوو ڕووباری بەناوبانگی ئەو ناوچەیەن، کە لە چیا سەر کەشەکانەوە سەرچاوە دەگرن. ئەو شارە زێدی (باباتاهیری هەمەدانی و مەفتونی هەمەدانی) و (خواجە ڕەشەدەدین- فەزڵ هەمەدانی) وەزیری بەناوبانگی سەردەمی ئێلخانیەکانە. ئەوانە لە کەسایەتیە ناودارەکانی کوردی ئەو شارەن. هەمەدان بە پێنجەمین شاری مێژوویی دادەنرێت لەسەر ئاستی وڵاتی ئێران، هەر ئەوەش وایکردووە، کە دەوڵەتە یەک لەدوای یەکەکانی ئێران، کار بۆ سڕینەوەی ناسنامەی کوردێتی ئەو شارە بکەن و ڕاستی مێژووەکەی بشێوێنن، چەند نەتەوەیەکی وەک (فاس و تورک) تێکەڵاوی دانیشتوانەکەی بکەن، بۆ کەمکردنەوە و نەهێشتنی ئاسەواری پڕ بایەخی مێژووی کورد لە شارەکەدا. گرنگترین شوێنەواری سەردەمی مادەکان کە لە شارەکەدا مابێت، هەیکەلی شێرێکە کە لە بەرد داتاشراوە و مادەکان دروستیان کردووە. ئەو شێرە هەتا ساڵی (١٩٣٠ز) بەپێوە بووە، بەڵام دواتر وردە وردە زیانی پێگەیشتووە و ناتەواو بووە.

تێبینیی: ئەو بابەتەم لە ژمارە (٤٦٧١) ڕۆژی دوو شەممە (٢٠٠٨/٩/٨) لاپەڕە (١١) ی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێدا لە ژێر ناوی (هەمەدانی ئەمڕۆ و ئەکباتانی دوێنێ) بڵاوکردۆتەوە.



مەیدانی تێکۆشان شاری هەمەدان



شێرە بەردینەکەی هەمەدان

## . شۆڕش و ڕاپەڕینی مادەکان دوای ڕوخانی دەوڵەتەکەیان

دوای لەناو چوونی دەوڵەتی ماد، لەلایەن کۆرش و هەخامەنشییەکانەوە، دوای (١٥٠) سەدو پەنجا ساڵیش هێشتا چەندین میرنشینی دوور لە دەسەڵاتی ئەوان، درێژەیان بە ژیانی سەربەخۆیی خۆیان داوە، چونکە هەخامەنشییەکان بەو ئاسانییە نەیانتوانیوە بەتەواوی دەست بەسەر هەموو ناوچەکانی دەوڵەتی ماددا بگرن، بەڵام لە چەند سەردەمێکی جیاوازدا، بەهۆی هەڵسوکەوتی ناشرین و سوکایەتی پاشایانی هەخامەنشییەوە، خەڵکی چەند ناوچەیەکی ماد ڕاپەڕشیوون، کە ئەو ڕاپەڕینانە لەلایەن (داریوشی یەکەم ٥٢٢- ٤٨٦پ.ز) ی سێیەم پاشای هەخامەنشییەکانەوە دامرێنراونەتەوە و سەرکوتکراون. ئەو ڕووداوانە بە ڕوونی لە بەردە نووسراوەکەی شاخی (بێستون) ی نزیک شاری کرماشان، بە (٣) سێ زمانی (فارسی کۆن، ئیلامیی و بابلی) نووسراون.

### نووسراوەکەی شاخی بێستوون

پێوانەی ستوونە نووسراوەکانی شاخی بێستون بەو شێوەیەی خوارەوەن:

ستوونی دووەم: (١٩٤) سانتیمەتر و تێکڕا (٩٨) دێرە و (١٦) بەندە.

ستوونی سێیەم: (١٩٥) سانتیمەتر و تێکڕا (٩٨) دێر و (١٥) بەندە.

ستوونی چوارەم: (١٩٤) سانتیمەتر و تێکڕا (٩٢) دێر و (٢٠) بەندە.

ستوونی پێنجەم: (٣٦) سانتیمەتر و تێکڕا (٦) بەندە.

نووسینە ئیلامییەکان لە دوو جێگا هەڵکەندراون، بەشی یەکەمیان دەکەونە لای ڕاستی وێنەکان و لە چوار ستووندا نووسراون، هەموویان (٣٢٣) دێڕن. هەروەها بەشی دووەمیش لەو نووسراوە کەوتونەتە لای چەپ و لە (٣) سێ ستوون پێکهاتوون. لەلای چەپی ئەوانیشەوە بە پارسی کۆن ڕووداوەکە نووسراوەتەوە، کە ئەوەی خوارەوە بەشێکیەتی: (من داریوش شای گەورەم، شای شاهان، پاشام لە پارسدا، شای کیشوەرەکان، کوڕی ویشتاسپ لە نەوەی ئەرشام هەخامەنشیی).

هەروەها داریوش لەو نووسراوەیدا ئاماژەی بەوە کردووە کە (٢٣) ناوچەی جیا



شاخی بێستوون

جیا باجیان بە داریوش داوە. لەو نوسینەدا زۆر بە ڕوونی و بەوردی باسی شۆڕش و تیاچوونی (گئوماتای موغ) کراوە، لەگەڵ باسی ڕاپەڕیووەکانی تر. لەو تۆمارەدا داریوش بەجۆرێک باسی لە گەورەیی و توانای خۆی کردووە، کە هەموو نووسینەکانی باسی سەرکەوتنەکانییەتی بە پشتیوانی (ئاهورامەزدا)[1]. داریوش لە ساڵی (٥٢١- ٥١٩پ.ز) بۆیادگاری لەوێدا تۆماریکردوون. بەپێیی ئەو سەرچاوەیە داریوش دوای شەڕێکی دوو ساڵ و چوارمانگ و یازدە ڕۆژە، ئینجا بەفەرمانڕەوایی هەخامەنشییەکان گەیشتووە، دواتر فەرمانیداوە، کە ناونیشانی خۆیی و ئەوانەی کە لێیی یاخیبوون، بۆ یادگاری لە سەر شاخی بێستون بنووسرێت. لەپاڵ نووسینەکەدا، وێنەی داریوشیش دروستکراوە، کە لەسەرووی داریوشەوە وێنەی (فروهەر)[2] ێک کە لەفڕیندایە و بە دەستی چەپی نیشانەیەکی پاشایی گرتووە و پێشکەش بە داریوشی دەکات دروستکراوە. بەرامبەر داریوش وێنەی (٩) نۆ کەسە شۆڕشگێڕەکە

١. ئاهورامەزدا: شارەزایانی زمانی پەهلەوی ساسانی، بڕوایان وایە کە وشەی (ئەهور) لە بنچینەدا لە وشەی (ئاسور) ییەوە هاتووە، کە ناوی خوای ئارییەکانی هیندۆئەوروپاییەکان بووە. ئەوانەی کە یەك خودایان پەرستووە. وشەی (مز) یش واتای جیهانی گەیاندووە، دواتر ئەو وشەیە بە هەندێك دەستکارییەوە بووە بە ئاهورامەزدا، کە واتای (خاوەندی جیهان) دەبەخشێت.

٢. فروهەر: وێنەی پیرە پیاوێکی باڵدارە. بەناونیشانی ئایینی زەردەشت پەیامبەر دەناسرێت. (نووسەر)




دروستکراون، کە هەریەکە پەتێکی لە ملدایە و دەستیان لە پشتەوە بەستراوە و بەپێوە وەستاون، لەگەڵ وێنەکانیشیاندا ناوەکانیان تۆمارکراوە. لەنووسنەکاندا وشەی درۆ کردنی تێدایە، کە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە هەریەکێک لەوانە درۆیکردووە، دواکەسیش لە گیراوەکان سەرکردەیەکی سکتییەکانە کە کڵاوێکی قوچی لەسەردایە. بەپێیی نووسراوەکەی بێستون ئەوانەی خوارەوە ناوی ئەو نۆ کەسە یاخیبووەن، کە لەداریوش ڕاپەڕیوون:

١. (ئاسرین) سەرکردەی ڕاپەڕینی یەکەم.

٢. (ندئیت بئیر) سەرۆکی ڕاپەڕینی بابلییەکان.

٣. (مرتیی) سەرکردایەتی دووەم ڕاپەڕینیکردووە.

٤. (خشترتیەی دووەم- فرائورت) سەرۆکی ڕاپەڕیووە مادەکان.

٥. (چیتر توخم) سەرۆکی ڕاپەڕیووە ساگارتییەکان[1].

٦. (گئوماتا) ناسراو بە بەردیە، یەکێک بووە لە موغەکانی ماد.

٧. (ئارخ) ئەویش سەرکردایەتی دووەمیین ڕاپەڕینیی بابلییەکانی کردووە.

٨. (فراد) لەناوچەکانی (مارژ) ڕاپەڕینی ڕێکخستووە.

٩. (سکوننخا) ڕابەرایەتی سکتییەکانی کردووە بۆ ڕاپەڕین.

١. ساگارتییەکان: لەسەردەمی ئاشوورییەکاندا، لە وڵاتی مادەکان نیشتەجێبوون. پێشتر ئەو هۆزە لە ناوچەی (سیستان) ی ئێستا، لە خۆرهەڵاتی وڵاتی ئێران نیشتەجێبوون، بەڵام دواتر بەرەو ناوچەکانی خۆرئاوا، واتە، وڵاتی مادەکان کۆچیانکردووە.



داریوشی یەکەم لە کێوی بێستوون

## ڕاپەڕینی یەکەم: گئوماتای موغ

بەپێی تۆمارە نووسراوەکەی بێستون، ئەو ڕاپەڕینە لە مانگی مارسی ساڵی (٥٢٢ پ.ز) ڕوویداوە، لە سەردەمی فەرمانڕەوایی (کامبیز ٥٢٧- ٥٢٢ پ.ز)ی کوڕی کۆرش، کە ئەوکاتە دووەم پاشای هەخامەنشییەکان بووە. بەوتەی هیرۆدۆت لەو کاتەدا، کامبیز بە هاوەڵی لەگەڵ (بەردیە) کە لە باوکەوە برای بووە و بە (ئسمردیس)یش ناوبراوە، درێژەی بە داگیرکارییەکانی باوکی داوەو بە لەشکرەکەیەوە سەرقاڵی داگیرکردنی وڵاتی میسر بووە.

شەوێک کامبیز لە کاتی لەشکرکێشییەکەیدا، لە میسر خەوێکی ناخۆشی بینیوە کە لەخەونەکەیدا: (بەردیە لەسەر کورسییەک دانیشتووە و تاجێکی لەسەرناوە، سەری ئەوەندە بەرزبووە، کە گەیشتۆتە ئاسمانەکان).

کامبیز بەهۆی ئەو خەونەوە پەشۆکاوە و ترسێکی زۆری لێنیشتووە، بۆیە بەشێوەیەکی نهێنیی پیلانی کوشتنی بەردیەی داناوە، چونکە کامبیز لەوە ترساوە، کە ڕۆژێک بێت، بەردیە پایە و سەڵتەنەتەکەی لێداگیر بکات. لەئەنجامدا، کامبیز بەردیەی ناردۆتەوە بۆ وڵاتی پارس و کەسێکیشی بەناوی (پەری ئەسپ) ڕاسپاردوە بۆ کوشتنی، پەری ئەسپیش بەگوێرەی دەستوری کامبیز، لەڕێگادا و لە نزیک کەنارەکانی دەریای سووردا، بەردیەی کوشتووە.

دواتر لە کاتی گەڕانەوەی بۆ ئەکباتان، لە وڵاتی سوریای ئێستادا، کامبیز گوێ بیستی جارچییەک بووە، کە لە ناو شاردا، بانگەوازی کردووە، کە بەردیە پاشای وڵاتی پارسە و دەبێت لە ئەو فەرمان وەربگرن. هەر بۆیە کامبیز لە قسەی ئەو بانگەوازکەرە زۆر سەری سوڕماوە! بەتوڕەیی سەیری پەری ئەسپی کردووە و پێی گوتووە:

(ئایا دەستورەکەت ئاوا جێبەجێ کردووە؟ ئەگەر دەستورەکەی منت جێبەجێکردووە، ئەو جارچییە چی دەڵێت؟ چۆن بەردیە خۆی بە فەرمانڕەوا دەزانێت؟)

لە وەڵامدا پەری ئەسپ گوتوویەتی: (من دەستوری ئێوەم هەر بەو دوو دەستەی

خۆم جێبەجێکردووە، بەو دوو دەستەش بەردیەم ناشتووە).

ئینجا دوای ئەوەی، کە بانگی جارچییەکەیانکردووە و پرسیاری ئەو بانگەوازەیان لێکردووە، ئەویش لە وەڵامی پرسیارەکەی ئەواندا گوتوویەتی: (من خودی بەردیەم نەدیتووە، بەڵام یەکێک لە کاربەدەستانی ئەو پێیی گوتووم، کە بانگەوازێکی ئاوا بکەم. هەمان کاربەدەست جارچییەکی زۆریشی ناردوە بۆ وڵاتانی تر، بۆ ئەوەی ئەوان لەهەموو شوێنێکدا بڵاوی بکەنەوە، کە بەردیە پاشای وڵاتی پارسە).

دوای کوژرانی بەردیە لەلایەن کامبیزی برایەوە، موبیدێک بە ناوی (گئوماتا)، کە ڕەنگ و شێوەی زۆر لەبەردیە چووە، لە هاوشێوەبوونی خۆی لەگەڵ بەردیەی ڕاستەقینە کەڵکی وەرگرتووە، بەیارمەتی برایەکی تری، کە موبیدی موغەکان بووە، بۆ ماوەیەک چووەتە سەر تەختی پاشایەتی، دواتر بڕیاریداوە، کە لە وڵاتی پارسدا، لە هەموو ئاوایی و شارەکانی ژێر فەرمانڕەوایی پاشای هەخامەنشییەکاندا، لە ناوخەڵکدا، بانگەواز بکەن، کە ئەو بەردیەی برای کامبیز و کوڕی کۆرشی هەخامەنشییە، چونکە ئەو کوشتنەی بەردیە لەوکاتەدا، بە نهێنی ئەنجامدراوە. لەهەمانکاتدا، بەردیە دەستوریداوە، کە لە وڵاتی پارسدا بانگەوازی ئەوە بکەن، کە دانیشتوانی وڵات هەتا ماوەی (٣) سێ مانگ لە پێدانی باج بۆ پاشا بوراون، هەروەها هیچ کەسێکیش بۆ خزمەتی سەربازی بانگ ناکرێت. بەوشێوەیە ماوەی (٨) هەشت مانگ بەردیە لە وڵاتدا فەرمانڕەوایی کردووە، بەبێ ئەوەی کەسێک هەستی پێبکات، کە ئەوە بەردیەی کوڕی کۆرش نییە.

دوای ئەو ماوەیە پەری ئەسپ بەفەرمانی کامبیز چوەتەوە بۆ وڵاتی پارس و دەربارەی ڕاستی ڕوداوەکە لێکۆڵینەوەی کردووە، گەیشتووەتە ڕاستی بەسەرهاتەکە و گەڕاوەتەوە بۆ لای کامبیز و پێیی گوتووە:

(کاتێک ئێوە بەرەو میسر کەوتونەتە ڕێ، کاروباری ماڵ و خەزێنەی خۆتان سپاردۆتە دەستی موبیدێک، کە ئەو موبیدە نازانم چۆن ئاگاداری ئەوە بووە، کە بەردیەی برای ئێوە کوژراوە، هەڵساوە تا لەو بابەتە کەڵک وەربگرێت، چونکە

برایەکی هەیە، ناسراوە بە بەردیەو تا ڕادەیەکیش هاوشێوەی بەردیەیە، لەو ڕووەوە ئەوی بە پاشای وڵات ناساندوە و خەڵکیش بەو مەبەستە، کە لە میسردا بۆ ئێوە ڕوداوێک ڕویداوە، ئەو بابەتەیان قبوڵکردووە، ئێستا بەردیەی دەستکردیان بە پاشای خۆیان داناوە).

لەوکاتەدا کامبیز خەفەت و پەژارەیەکی زۆر دایگرتووە و گوتوویەتی: (وای لە من، کە بەبێ هیچ شتێک بەردیەم کوشت، چونکە ئەو بەردیەی کە من لە خەونەکەدا بینیبووم، تاجی لەسەر بوو، سەری گەیشتبووە ئاسمان، ئەو بەردیەیە نەک برایەکەی من).

دوای ئەو ڕوداوە، هەر لە خاکی سوریادا، ڕۆژێک کامبیز ویستوویەتی شمشێرەکەی لە کەمەری ببەستێت، بەڵام لەوکاتەدا، شمشێرەکەی داکەوتووە و لاقێکی بریندار کردووە، لەئەنجامداً، بەهۆی قوڵی و کاریگەری برینی شمشێرەکەوە، کامبیز گیانی لەدەستداوە.

دواتر گەورەکانی وڵاتی پارس، دوای ئەوەی کە کامبیز مردوە، گەڕاونەتەوە بۆ وڵاتی خۆیان.

سەرئەنجام یەکێک لە گەورەکانی وڵاتی پارس، بەناوی (ئۆتانس)، گومانی لە بەردیە کردووە، بەهۆی ئەوەی کە بینیویەتی بەردیە لە کۆشکی خۆی ناچێتە دەرەوە و هیچ کاتێکیش گەورەکانی وڵات بۆ لای خۆی بانگ ناکات، لەکاتێکدا، یەکێک لە نەریتە باوەکانی پاشایانی پێشتری وڵات ئەوە بووە، کە لە ڕۆژە دیاریکراوەکانی جەژنەکاندا، گەورەکانی وڵاتیان بۆ لای خۆیان بانگ کردون، هەروەها لە ڕۆژانی دیکەشدا، ناودارانی وڵات توانیویانە بە یارمەتی وەرگرتن لە پاشا، بچنە لای ئەو، ڕاپۆرتی کاروباری خۆیان بدەنە خزمەتی پاشا.

سەبارەت بەو گومانە ئۆتانس نووسراوێکی ناردوە بۆ کچەکەی، کە ئەو یەکێک بووە لە هاوسەرەکانی کامبیز و لە کۆشکی پاشایەتیدا ژیاوە، بۆ ئەوەی بەردیە بە باشی ببینێت و تێبگات، کە ئەوە بەردیەی ڕاستییە یان کەسێکی هاوشێوەی ئەوە،

بەڵام کچەکەی ئۆتانس لە وڵامی باوکیدا گوتوویەتی: (من ناتوانم ئەو بابەتە لێک بدەمەوە، چونکە هەرگیز بەردیەم نەبینیووە، بۆ ئەوەی کە بزانم ئایا ئەوە بەردیەی ڕاستەقینەیە یان کەسێکی ترە).

لە وڵامدا ئۆتانس بۆ دووەمجار بەو شێوەیەی خوارەوە کچەکەی ئاگادارکردۆتەوە: (لە ناو هاوسەرەکانی کامبیزدا، بێگومان (ئاتوسا) باش بەردیە دەناسێت، لەوانەیە تۆ بتوانی لە ئاتوسا بپرسی، کە ئایا ئەو پیاوە بەردیەیە یان هاوشێوەکەیەتی).

دیسان کچی ناوبراو، لە وڵامی باوکیدا گوتوویەتی: (بەداخەوە لە کاتێکەوە بەردیە بووەتە پاشا، ژنەکانی کامبیزی وەها لەیەکجیاکردۆتەوە، کە ئێمە بەهیچ جۆرێک لەگەڵ یەکدا پەیوەندیمان نییە، لە ئەنجامدا من ناتوانم لەو پرسیار بکەم، کە ئایا ئەو پیاوە بەردیەی ڕاستەقینەیە یان پیاوێکی دیکەیە).

بەڵام ئۆتانس پێداگری لەسەر ئەوە کردووە، کە لە ڕاستی مەسەلەکە تێبگات، هەر بۆیە بۆجارێکی تر و بە نووسراوێکی تر بەکچەکەی گوتووە: (بەردیەی درۆینە گوێیی نییە، چونکە گوێیان بەهۆی خیانەتێک، کە پێشتر کردویەتی بڕیووە، لە کاتێکدا، بەردیەی ڕاستەقینە گوێیی هەیە، کاتێک ئەو پیاوە خەوت، تۆ گوێیەکانی لە ژێر پێچەی سەریدا ببینە و بزانە کە گوێیی هەیە یان نا).

دیسان کچەکە وڵامی باوکیداوەتەوە، کە: (ئەوکارە زۆر مەترسیدارە، ئەگەر ئەو لە خەو هەڵبستێت و بزانێت سەیری گوێیی دەکەم، دەیکوژێت)، بەڵام ئۆتانس ئەوەندە پێداگری کردووە، هەتا کچەکەی قبوڵی کردووە و شەوێک کە بەردیە لەخەودا بووە، سەیری گوێیەکانی کردووە، دواتر وەکو خۆی بەسەرهاتەکەی بە باوکی ڕاگەیاندوە، کە ئەو بەردیەیە گوێیەکی نییە، پاشان دوای ئەوەی ئۆتانس باوەڕیکردووە، کە بەردیە بەدرۆ خۆیکردووە بە فەرمانڕەوایی وڵات و بەردیەی ڕاستەقینە نییە. داریوش کە لە لکێکی ترەوە شازادە بووە و لە خانەوادەیەکی تری هەخامەنشییەکان بووە، ئۆتانس ئەو باسەی بە داریوش ڕاگەیاندوە. هەر بۆیە داریوش وەکو سەرکردەی (٧) حەوت کەسی بەناوبانگی وڵات، تێکۆشاوە

هەموو خەڵکی ناوچە جیا جیاکانی وڵاتی پارس ڕازیبکات، بۆ ئەوەی کە گئوماتا سەرنگوم بکەن. بەومەبەستە داریوش و ئۆتانس چوونەتە شوش و لەوێدا لەگەڵ (٥) پێنج کەسی تر ئەنجومەنێکیان پێکهێناوە و کەوتوونەتە ڕێ، سوێندیانخواردوە کە نەگەڕێنەوە هەتا بەردیەی ساختە لە پاشای وڵات نەخەن، چونکە بەبڕوای ئەوان، بەردیە مەبەستی بووە دەسەڵات لە پارسەکان وەربگرێتەوە و دووبارە فەرمانڕەوایی بۆ مادەکان بگێڕێتەوە.

دوای ئەوەی ئەو کۆمەڵە لە گەورە پیاوان گەیشتوونەتە نزیک قەڵای گئوماتا، لە (سیکایائو وانیش) ی ناوچەی (نیسا)، لە وڵاتی مادەکان، لەوکاتەدا، ئۆتانس بە داریوشی گوتووە: (ژمارەی ئێمە کەمە و لە حەوت کەس زیاتر نین، بۆیە ناتوانین بەردیەی دەستکرد لە فەرمانڕەوایی لابدەین، باشتروایە، کە چەند کەسێکی تر بکەینە هاوڕێیی خۆمان، کاتێک ژمارەی ئێمە گەیشتە ڕادەی پێویست، لەبەرامبەریدا ڕادەوەستین)، بەڵام داریوش لە وەڵامدا گوتوویەتی: (ئەو پیاوە خەڵک خەڵەتێنە، بەو بەخشش و بەخشینەوەیە هەندێک خەڵەتاوی لە دەوری خۆی کۆکردۆتەوە، هەر کاتێک ئێمە پیلانی خۆمان لەگەڵ کەسانی تردا بخەینە بەرباس، ئەوانە بۆ خۆشرینکردن و وەرگرتنی پاداشت، خێرا ڕاپۆرتی خۆیان دەدەنە بەردیەی درۆین و ئەو کاتە هەموومان دەکوژێت).

دوای ئەوەی کە ئەو حەوت کەسەکە بەرە و کۆشکی بەردیە کەوتوونەتە ڕێ و خۆیان بە پاسەوانەکانی بەردییە ناساندوە، کە ئەوان دەبێت بۆ کارێکی زۆر پێویست و بەپەلە بەردیە ببینین. هەروەک کە داریوش پێشبینی کردووە، پاسەوانانی کۆشک کە داریوش و ئەو پیاوە گەورە و بەناوبانگانەیان بینیووە، ڕێگیرییان نەکردون و چوونەتە ژوورەوە. پێش ئەوەی ئەوان بچنە ناو کۆشکەکەوە، داریوش هەندێک لە نۆکەرەکانی خۆی ڕاسپاردوە، کە بچن خەڵک ئاگاداربکەنەوە، کە بۆ کارێکی گرنگ خۆیان بگەیەننە بەردەمی کۆشکی پاشا. لەوکاتەدا، کە خەڵکەکە کۆبوونەتەوە، پەری ئەسپ کە کاتی خۆی بەفەرمانی کامبیز بەردیەی کوشتووە، چووەتە سەر

قەلاکە و دەستیکردووە بە قسەکردن بۆ خەڵکەکە. دوای ئەوەی کە هەمووان ئامادە بوون، بۆ بیستنی قسەکانی پەری ئەسپ. ئینجا پەری ئەسپ باسێکی بنەماڵەی هەخامەنشییەکانی کردووە، دواتر خزمەتە گەورەکانی کۆرشی دامەزرێنەری دەوڵەتی هەخامەنشیی، بۆ خەڵکەکە باسکردووە، هەتا گەیشتۆتە ئەو جێگایەی، کە چۆن کامبیز فەرمانی پێکردووە، بەردیە بکوژێت. لەو کاتەدا، بەگریانەوە گوتوویەتی: (ئەی خەڵکینە خۆتان بۆ بیستنی نهێنییەکی گەورە ئامادە بکەن، من بەو دوو دەستەی خۆم بەردیەم کوشتووە و تەرمەکەیم ناشتووە).

ئینجا بە ئاماژە شوێنی دروستی گۆڕی بەردیەی نیشانی خەڵکەکە داوە و گوتوویەتی: (ئەگەر هەر کەسێک لەوبارەیەوە گومانی هەیە، بچێت و گۆڕەکەی هەڵبداتەوە و بیبینێت، چونکە من لەوکاتەدا، هەر بەجلەکانی خۆیەوە بەردیەم ناشتووە. ئەو کاتە لە ناسینی ئەودا هیچ کەسێک بچوکترین گومانی نابێت، من لەوکارەدا، دەستوور و فەرمانی کامبیزم جێبەجێکردووە، ئێستاش خۆم بە تاوانبار دەزانم، هەر بۆیە ئێستا خۆم سزای تاوانی خۆم دەدەمەوە).

دوای ئەوەی پەری ئەسپ قسەکانی تەواوکردووە، بە بەرچاوی خەڵکەکەوە، لەسەر قەلاکە خۆی خستۆتە خوارەوە و هەر لەوێدا، گیانی دەرچووە. لەوکاتەدا، کە داریوش و هاوەڵەکانی لەناو کۆشکەکەدا بوون، سەبریانکردووە هەتا قسەکانی پەری ئەسپ کۆتاییان پێهاتووە. لەبەرامبەردا، پاسەوانەکان لەئەنجامی ئەو قسانەی پەری ئەسپدا سەریان سوڕماوە! کاتێک کە بینیوویانە ئەو پیاوەی کە خۆی تاوانبار کردووە هەڵساوە بە کوشتنی خۆی، چونکە ئەو ڕووداوە ڕاستگۆیی قسەکانی ئەوی سەلماندووە. ئینجا داریوش و (٦) شەش کەسەکەی تر بەرەو ژووری بەردیە ڕۆیشتوون، بەبێ ئەوەی ڕووبەڕووی هیچ بەرگرییەک ببنەوە، بەردیەو براکەی کە بە هاندەر و هۆکاری ئەو پیلانە دانراوە کوشتوویانن. بەپێیی لێکدانەوەی ڕۆژ ژمێر و ڕێکەوتی ساڵەکان، داریوش و هاوڕێکانی لە (٥٢٢/٩/٢٩ پ.ز) کۆتاییان بە دەسەلات و فەرمانڕەوایی هەشت مانگەی بەردییە هێناوە.

## ڕاپەڕینی دووەم: (خشترتیەی دووەم)

ئەو ڕاپەڕینەش لە سەرەتای مانگی (١٢ی ٥٢٢ پ.ز)، لە کاتێکدا سەریهەڵداوە، کە داریوش سێیەم پاشای هەخامەنشییەکان لە وڵاتی بابلدا سەرگەرمی شەڕ و دامرکانەوەی ڕاپەڕینەکانی ئەو وڵاتە بووە. لەوکاتەدا، گەورە پیاوێکی مادەکان، بەناوی (خشترتیەی دووەم- فرائورت) سەرکردەی ڕاپەڕینێکی تری کردووە. دوای بیستنی ئەو هەواڵە داریوش نزیکترین هاوڕێیی خۆی کە ناوی (میدارنا) بووە، ڕایسپاردوە بۆ شەڕی خشترتیەی دووەم. میدارنا لەناوچەیەک لە سنوری خۆرئاوای وڵاتی مادەکاندا، لەگەڵ یەکێک لە سەرکردەکانی سوپای خشترتیەی دووەم کەوتۆتە شەڕەوە و لە ئەنجامدا، سوپاکەی خشترتیە تێکشکاوە. دواتر خشترتیە لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لە سوارەکانیدا ڕایکردووە بۆ ناوچەیەک لە نزیک شاری ڕەی. دواتر داریوش کۆمەڵێک سەربازی تری ناردوە، بۆ سەر حەشارگەی خشترتیە، لەئەنجامدا، ڕۆژی (٥٢١/١/١٢ پ.ز) خشترتیەی دووەمیان دەستگیرکردووە.

داریوش لە نووسراوەکەی بێستوندا، لە بارەی سەرئەنجامی خشترتیەوە، بەو جۆرەی خوارەوە ڕوداوەکەی تۆمارکردووە:

(خشترتیەیان دەستگیرکرد و هێنایان بۆ لام، منیش لوت و گوێ و زمانم بڕی، هەر دوو چاوەکانیم دەرهێنا، لە دەرباری مندا، بە زنجیر بەستیانەوە و هەموو خەڵکی شۆڕشگێڕ بەچاوی خۆیان چاویان پێکەوت، ئینجا فەرمانمدا، لە ئەکباتان نایانەوە بە نیشانەی نێزەوە. ئەوانەشی کە لەسەرەتاوە لایەنگری ئەویان کردبوو، لەناو قەڵای ئەکباتاندا لە دارمدان).

## ڕاپەڕینی سێیەم: (چیتر توخم)

لەگەڵ ئەو شەڕانەشدا، شۆڕش و ڕاپەڕینی مادەکان بەوە کۆتایی نەهاتووە، چونکە هۆزی (ساگارتییەکان) یش نەیانویستووە ملکەچی هەخامەنشییەکان بین، بەو هۆیەوە پیاوێک لەو هۆزە، کە ناوی (چیتر توخم) بووە، ئەویش ساڵی (٥٢١ پ.ز) دەستیداوەتە شۆڕش، خۆی بە پاشای هۆزەکەی ناساندوە و گوتوویەتی: (من لە خانەدانی هوخشترە - کیاکسار)م.

لەئەنجامدا، داریوش بۆ ئەوەی ئەو شۆڕشەش بکوژێنێتەوە، کە دیسان لەسەرزەمینی مادەکاندا سەریهەڵداوە، بۆ ئەو مەبەستە چەند کەسێک لە گەورە پیاوان، وەفاداری خۆیان بۆ داریوش دەربڕیووە و پەیمانی هاریکارییان پێداوە، هەر بۆیە داریوش لەشکرێکی بەسەرکردایەتی (توخمسپاد) ڕێکخستووە، بۆ سەر چیتر توخم، ئەوانیش هەڵیانکوتاوەتە سەری و لەئەنجامدا کوشتویانە.

لە بەشی (١٦) شازدەی بەردە نووسراوەکەی بێستوندا، داریوش بەڕوونی باسی ئەو ڕاپەڕینەشی کردووە، بەو جۆرەی خوارەوە ئاماژەی بە سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی هۆزی ساگارتییەکانداوە: (پیاوێک بە ناوی (چیتر توخم)، لە ناو هۆزی ساگارتییەکاندا دژی من ڕاپەڕی، بە خەڵکەکەی گوتبوو، من شای ساگارتیم و لە نەوەی هوخشترەی پاشای مادم. منیش لەوکاتەدا، لەشکری پارس و مادم بەسەرکردایەتی (توخمسپاد)، کە ئەو لە پیاوە ناودارەکانی مادەکان بوو و لەهەمانکاتیشدا فەرماندەی سوپاکەم بوو، گوێ ڕایەڵی فەرمانەکانی من بوو، ناردمە سەری، هەتا ئەو پیاوە یاخی بووە لەناو بەرێت. پێم گوتن کە لەشکری ئەو نافەرمانە بشکێنن. ئەوە بوو کە توخمسپاد بە سوپایەکەوە بەڕێکەوت و لەگەڵ چیتر توخم بەشەڕهات. ئاهورامەزدا لە یارمەتی و پشتگیری خۆی دڵنیای کردمەوە، بۆیە بە ویستی ئاهورامەزدا بەسەر ئەو هەڵگەڕاوانەدا سەرکەوتم و چیتر توخمیان بە گیراوی هێنایە بەردەستم، منیش هەردوو گوێ و لوت و زمانی ئەوم بڕی و

چاوێکم دەرهێنا، دواتر بڕیارمدا، لەبەر دەرگای کۆشکەکەمدا، بەزنجیر بەستیانەوە، بۆ ئەوەی هەموو خەڵک ئەو بەوشێوەیە بەچاوی خۆیان ببینن. پاشان سەربازەکانم ئەویان لە (ئاربل – ئەربائیلۆ) هەڵواسی، ئینجا کردیانە نیشانەی تیر و نێزە و کوشتیان. بەوە ئاژاوە و بگرە و بەردە کۆتایی پێهات).



**چیتر توخم**

**لە نەخشی کێوی بێستون وەرگیراوە**

دوای ئەو شەڕ و ئاژاوانە لەکاتێکدا کە داریوش گەیشتووەتە سەر تەخت و دەسەڵاتی دەوڵەتی هەخامەنشییەکان، هەریەک لە ئاتوسای ژنی پێشتری کامبیزی پاشای پێشوو تر و (پارمیداد)ی کچی بەردیەی مارەکردون و کردونیەتە هاوسەری خۆی.

## بەشی دووەم

## ژیانی (زەردەشت) و ئایینی (مەزدیسنا)

### ژیانی (زەردەشت)

بەپێیی سەرچاوە مێژووییەکان کاتێک (دوغدو)ی دایکی پەیامبەر (زەردەشت)، تەمەنی بووە بە (١٥) پازدە ساڵ، لەو کاتەدا، (فراهیم)ی باوکی کە هۆزەکەیان لە شاری ڕەی نیشتەجێ بوون، بە تاوانی دەستێکەڵکردن لەگەڵ جادوکاران، لە بنەماڵەکەی خۆی دەریکردووە، دوای ماوەیەک سەرگەردانی دوغدو، ئینجا پەنای بردووە، بۆ ناو هۆزی (سپیتمان)، کاتێک سەرۆکی ئەو هۆزە دیاردەی خانەدانی و نیشانەی گەورەیی لە هەڵسوکەوتی ئەو کچە لاوەدا بینیووە، تێکەڵ بە خێزانی خۆیکردووە. دوای مانەوەی دوغدو لە ناو هۆزی سپیتمان، لەئەنجامدا، ئەوین و خۆشەویستی کەوتۆتە نێوان دوغدو و (پورشاسپ)، بەپێیی پەرتوکی (دینکەرد)، باوکی پورشاسپ سەرکردەی هۆزی سپیتمان بووە. لەو کاتەدا، پورشاسپ گەنجێکی تازەپێگەیشتوو بووە، ئەویش وەکو زوربەی ئەندامانی هۆزەکەی، بەکاری شوانی و ئاژەڵدارییەوە خەریک بووە، سەرئەنجام پورشاسپ و دوغدو بوونەتە هاوسەری یەکتر.

ناوی تەواوی (زەردەشت) (سیتاما کوڕی پورشاسپ کوڕی پیترسپ)ە، لە ساڵی (٦٦٠ پ.ز) لە ناوچەی (موکریان)ی نزیک دەریاچەی ئوورومییەی ئێستا، لە گوندێک بەناوی (مارلین) لەدایکبووە. ئەوناوچەیە ئەوکاتە، بەشێک بووە لە ناوچەکانی ژێردەسەلاتی فەرمانڕەوایانی ماد، بەپێیی سەرچاوەکان کاتێک (زەردەشت) لەدایکبووە، دەستیکردووە بە قاقای پێکەنیین و پەنجەی بەرەو ئاسمان هەڵبڕیوە. دواتر (زەردەشت) لە تەمەنی (٧) حەوت ساڵییەوە، هەتا تەمەنی (١٥) پازدە ساڵی لە لای پیاوێک بەناوی (بەرزین) خوێندویەتی، بەو جۆرە بووەتە زیرەکتریین ئەندامی هۆزەکەی خۆیان. (زەردەشت) لە تەمەنی (٢٠) بیست ساڵیدا، بۆ دۆزینەوەی نهێنییەکانی جیهان، دایک و باوک و هاوسەر و خزمەکانی بەجێهێشتووە و ڕویکردۆتە تەنیایی، لە ئەشکەوتێکی شاخی (سەبلان)،

ماوەی (١٠) دە ساڵی بەسەربردووە، بڕیاریداوە، هەتا ئەو کاتەی ڕێگە چارەیەک بۆ ڕزگارکردن و سەرفرازی کۆمەڵگا نەدۆزێتەوە، نەگەڕێتەوە ناوخەڵک. ئەوماوەیە لەپەناگیریدا، بەقوڵی بیری لە چاکە و خراپەکانی جیهانکردۆتەوە، هەتا سەرچاوەی بەدبەختییەکانی بۆ دەربکەوێت و بتوانێت کۆتاییان پێبهێنێت بۆ ئەوەی لەئەنجامدا کۆمەڵگا بەرەو خۆشی بەرێت. (زەردەشت) لە ماوەی ئەو دە ساڵەدا، زۆر بەکەمی خەوتووە، چونکە کاتەکانی خۆی زیاتر بۆ بیرکردنەوە تەرخانکردووە، بۆ (زەردەشت) ڕونبووەتەوە، کە جیهان دوو ڕەگەزی لە یەکتر جیاواز دەیبات بەڕێوە، ئەویش ئاهورامەزدا، واتە، کاری چاکە (سپێنتامینۆ) و (ئەهریمەن) واتە، کاری خراپە (ئەنگرەمینۆ)ن، هەروەها لەو ماوەیەشدا، خۆراکی سەرەکی بریتیی بووە لە پەنیر و میوە و گیا. سەرئەنجام دوای ئەو دە ساڵە، ئاهورامەزدا پەیامێکی بە ناوی (ئاڤێستا) وە بۆناردوە. دوای ئەوە (زەردەشت) دەستیکردووە بە بڵاوکردنەوەی ئایینەکەی، بەناوی (مەزدیسنا). پەیامبەر (زەردەشت) دەفەرموێت: (شتی هەرەباش بۆ مرۆڤ کشتوکاڵکردن و بەخێوکردنی ئاژەڵە)، هەروەها دزی و درۆزنی لەلای (زەردەشت)، لە شتە زۆر خراپەکان بووە. (زەردەشت) (ئاو، ئاگر، خاک و هەوا)ی بە چوار بنەمای زۆر گرنگ و پیرۆز داناوە و گوتوویەتی شتی پاک نابێت بەهیچ شێوەیەک پیس بکرێت، چونکە ئاگر لە خۆرەوە هاتۆتە سەرزەمیین و بووە بە نیشانەیەک بۆ ئەو. یەکەم کەسێک کە ئایینەکەی پەسەندکردووە، کوڕێکی ئامۆزای بووە، بەناوی (مەدیوما کوڕی ئیراستی). (زەردەشت) پەیامبەر لەناوخەڵکدا ڕایگەیاندوە، کە ئایینی کۆنیان پوچە، خودا و بتەکانیان لە بەرد و دارێکی بێگیان بەولاوە هیچی تر نییە، تاکە پەرستراو تەنیا ئاهورامەزدایە، کە بیروهۆشی بەمرۆڤ بەخشیوە، هەتا ژیرانە کاری چاک و خراپ لە یەکتر جیا بکاتەوە. (زەردەشت) دە ساڵ بەوشێوەیە لەناو هۆزەکەیدا ماوەتەوە، دواتر لەلایەن فەرمانڕەواکانی مادەوە و پیاوانی ئایینی موغەکانەوە زۆر دژایەتی کراوە و توشی ڕووبەڕووبوونەوە بووەتەوە، ئەو بیروبۆچونانە بوونەتە هۆی ئەوەی، کە موغەکان و سەرکردە و پیاوە ئایینیەکان و سەرانی هۆزەکان، ئەویان بە دوژمنی بیرو

باوەڕەکەی خۆیان زانیووە، کەڵکیان لە پشتگیری یەکتری بینیوە، بۆ ئەو مەبەستە ئەنجومەنێکیان پێکهێناوە و بڕیاری دوورخستنەوەی (زەردەشت) یان دەرکردووە. جیاوازی ئایینی (زەردەشت) و بیروباوەڕی موغەکان، ئەوە بووە کە (زەردەشت) دوو بنەمای هەبووە بۆ ئایینەکەی، کە ئەوانیش بنەمای خێر و بنەمای شەڕ بوون، بەڵام لەلای موغەکان دوو خواوەند هەبووە، خواوەندی خێر و خواوەندی شەڕ بوون. ئەو جیاوازیە بووە بە هۆکار بۆ دەرکردنی (زەردەشت)، لەلای نەتەوەکەی و هەر بۆیە ڕێزی لێنەگیراوە. (زەردەشت) کاتێک ناچاری کۆچپێکردن بووەتەوە، خێزانەکەی و مەدیومای ئامۆزای و هەندێک لە پەیڕەوکەرانی ناوچەکانی خۆیان بەجێهێشتووە، کە کەوتۆتە باکووری خۆرئاوای وڵاتی مادەکان. بەرەو باکووری خۆرهەڵاتی ئەو وڵاتە کۆچیانکردووە، بەڵام هاوسەرەکەی کە ناوی (هافویە) بووە، باوەڕی بە ئایینەکەی نەهێناوە و لەگەڵیدا نەڕۆیشتووە. ئەگەر سەرنج بدەینە هەندێک لە بەندەکانی یەسنای (٥١) ، کە (زەردەشت) پەیامبەر لەکاتی کۆچەکەیدا خوێندونی، دەردەکەوێت کە کۆچەکەیان لە وەرزی زستاندا بووە، (زەردەشت) بەردەوام بووە لە کۆچەکەی، هەتا گەیشتۆتە وڵاتی (بەڵخ- باختەر)، کە شارێک بووە لە باکووری وڵاتی ئەفغانستانی ئێستا، نزیک سنوری وڵاتی (ئۆزبەکستان). بۆیە (زەردەشت) لە شوێنی خۆی کۆچیکردووە و ڕوویکردۆتە ئەو ناوچەیە، بەمەبەستی بڵاوکردنەوە و برەودان بە ئایینەکەی. دوای دوو ساڵ لە نیشتەجێبوونی لەو ناوچەیە، پەیامبەر (زەردەشت) داوای لە (گوشتاسپ)ی فەرمانڕەوای ناوچەکە کردووە، کە باوەڕ بە ئایینەکەی بهێنێت. لەهەمانکاتدا، گوشتاسپ بڕیاریداوە، کە ئەو کارە گرنگە بخاتە بەر ڕاوێژی ئەنجومەنەکەی، دواتر گوشتاسپ (جاماسب) ی شالیار و وەزیری دانا و زیرەکی خۆی ڕاسپاردوە، کە لەو بیر و باوەڕەی (زەردەشت) بکۆڵێتەوە. دوای پەسەندکردنی ئایینەکە، گوشتاسپ چووەتە سەر ئایینی (زەردەشت)، دواتر (زەردەشت) بەهاوکاری گوشتاسپ و (ئەسفەندیار) ی کوڕی بە ئاشکرا لەناوچەکە دەستیکردووە بە بڵاوکردنەوەی ئایینەکەی، دوای ئەوە (فرەشوشترە)ی برای جاماسبی وەزیری پاشا ئایینی نوێیی پەسەند کردووە

و کچەکەی کە ناوی (هودی) بووە، لە (زەردەشت)ی مارەکردووە و (زەردەشت) بۆ جاری دووەم خێزانی پێکەوەناوەتەوە، جاماسبی وەزیری گوشتاسپیش بووە، بە هاوسەری یەکێک لە کچەکانی (زەردەشت)، بەناوی (پوروچیستا)، کە ئەو کچە لە ژنی یەکەمی (زەردەشت) بووە. (زەردەشت) بۆ هەڵبژاردنی هاوسەری ئایندەی کچەکەی لە یەکێک لە گاتەکانی یەسنای (٥٣)ی ئاڤێستای پیرۆزدا و لە بەندی (٣) دا کە لە ئاهەنگی بەشودانی کچەکەیدا فەرموویەتی بەوشێوەیە هاتووە: (ئێستا تۆ ئەی پوروچیستا، کە یەکێکی لە بنەماڵەی سپیتمان و جوانترین کچی (زەردەشت) یت، من لە ڕووی پاکی و ڕاستی و خوڕەوشت چاکییەوە، جاماسپم بۆتۆ هەڵبژاردوە. لەبەر ئەوەی یەکێکە لەو ڕاستکردارانەی بوون، بە پشتیوان ڕاستی بۆ ئایین. ئێستا بچۆ بیر و هۆش بکە بەڕێنما، کەی پەسەندت بوو، ئەوسا بڕیاری زەماوەندکردنت بدە).

پەشتەکان نیشانی دەدەن، کە (زەردەشت) باوکی (٣) سێ کوڕ و (٣) سێ کچ بووە، کوڕەکانی ناویان (ئیسەتڤاستره، ئورڤەتەتنەرەو هۆرەچیترا) و کچەکانیشی بەناوەکانی (فرینی، تریتی و پوروچیستا) بوون. دواتر ئیسەتڤاسترەی کوڕی (زەردەشت)، بووە بە پێشەوای موغەکان و ئوروڤەتەتنەرە بەسەرداری وەرزێران و هۆرەچیتراش بەسوپا سالار و پێشەوای لەشکر لەناوچەی بڵخدا.

گوشتاسپی پاشای بەڵخ، ئەوکاتە ژێردەستە و باجدەری تورانییەکان بووە، هەربۆیە (زەردەشت) داوای لە گوشتاسپ کردووە، کە ئەگەر (ئەرجاسپ)ی پاشای تورانییەکان باوەڕ بە ئایینەکەیان نەهێنێت، نابێت چیتر باج بە تورانییەکان بدات. دوای ئەوەی ئەرجاسپ سوور بووە لەسەر بیرو باوەڕەکەی خۆی و وەرگرتنی باجیش لە گوشتاسپ، بەو مەبەستە گوشتاسپ بڕیاریداوە، کەخۆی لەژێردەستی تورانییەکان ڕزگار بکات. لەئەنجامدا شەڕ لەنێوان هەردوو لادا ڕوویداوە. دوای شەڕ و هێرشێکی زۆری هەردوو لا، تورانییەکان لە هێرشی دووەمی سوپاکەیاندا بۆ سەر شاری بەڵخی پایتەختی گوشتاسپ، شارەکەیان داگیر و وێرانکردووە، لەهەمانکاتی ئەو شەڕ و داگیرکارییەدا، (زەردەشت) لە پەرستگاکەی خۆیدا، لە ئاتەشگەی (نوش ئازر)، خەریکی خواپەرستی و نوێژکردن بووە، بۆ سەرکەوتنی سوپاکەیان بەسەر

تورانییەکاندا، بەڵام لەوکاتەدا یەکێک لەسەربازە تورانییەکان، بەناوی (براتریش)، لە ناکاو لەپشتەوە هێرشی کردۆتە سەر پەیامبەر (زەردەشت)، بەخەستی برینداری کردووە، بەڵام (زەردەشت)یش لەکاتی بەرگریکردن لەخۆی، سەربازەکەی کوشتووە، دواتر لە ئەنجامی کاریگەری برینەکانی، (زەردەشت) دوای (٤٧) چل و حەوت ساڵ پەیامبەرێتی، واتا، لە تەمەنی (٧٧) حەفتا و حەوت ساڵیدا و لە ساڵی (٥٨٣ پ.ز)، کۆچی دوایی کردووە. لەئێستادا هەندێک لە مێژوونووسان لەوباوەڕەدان، کە گۆڕی (زەردەشت) پەیامبەر لە شاری (مەزار شەریف)ی وڵاتی ئەفغانستانە و گۆڕی دوغدوی دایکیشی، لە نزیک شاری ئوورومییەی ئێرانە.

تێبینیی: ئەو بابەتەم لە ژمارە (١٣) زستانی (٢٠١٠) ساڵی سێیەمی گۆڤاری پشدەردا، لە ژێر ناوی (زەردەشت دیارترین پەیامبەری کورد) بڵاوکردۆتەوە.



لەوکاتەدا، ئاڤێستا بەفەرمانی گوشتاسپی فەرمانڕەوای بەلخ، بە زمانی ئاڤێستایی، کە زمانی هۆزی (ماکیین)ی مادەکان بووە، (٢) دوو دانەی نووسراوەتەوە، کە هەردانەیەکی لە پەرستگایەکی گەورە و تایبەتدا پارێزگاری لێکراوە، دانەیەکی لە ئاتەشگەی قەڵای (نیشتک) دانراوە، کە دواتر ئەو دانەیە لە ئاڤێستا، لە خەزێنە و ئەرشیفی کتێبخانەی دەوڵەتی داریوشی یەکەمی پاشای هەخامەنشیی دانراوە، لەسەر پێستی (١٢٠٠٠) دوازدە هەزار گا، بە ئاوی زێڕ نووسراوە و ڕازێنراوەتەوە، بەڵام دواتر ئەو دانەیە، لە کاتی هێرشەکەی (ئەسکەندەری مەکەدۆنی)، بۆ سەر خاکی پاشای هەخامەنشیی، بەدەستی سوپاکەی ئەسکەندەر سوتێنراوە. کە لەو سەردەمەدا، ئاڤێستا بەجۆرێک سوتێنراوە، لە پێنج بەشی سێ بەشی بەتەواوی لەناوچووە. دانەکەی تریش لە ئاڤێستا، لە ئاتەشگەی (ئازەر گوشنەسپ)ی ئازەربایجان دانراوە، کە ئەو شوێنە ئێستا بە (تەختی سولەیمان) ناودەبرێت، بەدووری (٢٤) کیلۆمەتر لە باکووری خۆرهەڵاتی (تیکاب)ی باکووری شارۆچکەی (بیجاڕ) هەڵکەوتووە لە خۆرهەڵاتی کوردستان. ئەو دانەیەی ئازەر گوشنەسپیش، ئەو کاتە بەفەرمانی ئەسکەندەر، براوە بۆ وڵاتی یۆنان و دواتر وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی یۆنانی. ئەو کاتە ئاڤێستا بریتیی بووە لە (٢١) بیست و یەک پەڕتوک و (٨١٥) بەش. ئایینی (زەردەشت) لە هێرشی ئەسکەندەری مەکەدۆنیدا بۆ سەر



وڵاتی فارس، تا سەردەمی ئەردەشێری پاپەکان، واتە، ماوەی نزیکەی (٦) شەش سەدە، هەموو پەڕاوەکانی تایبەت بەو ئایینە لەناوچوون، لەوە بەدواوە، بەدرێژایی چەند سەدەیەک، ئاڤێستا لە لای خەڵک و پەیڕەوکەرانی ئایینی (زەردەشت)ی تەنها بەشێوەی سروود و لەبەرکردن ماوەتەوە.

دوای ڕوخانی دەوڵەتی ماد، بۆ یەکەمجار، لەلایەن داریوشی یەکەمی پاشای هەخامەنشییەوە، لە ساڵی (٥٢١ پ.ز)، ئایینی (زەردەشت)ی کردۆتە ئایینی فەرمی دەوڵەتەکەی، کە یەکەمجار بووە ئەو ئایینە لەلایەن دەوڵەتێکەوە پشتگیری لێبکرێت. دوای لەناوبردنی ئاڤێستا، لەلایەن سوپای ئەسکەندەرەوە، دووبارە لەسەردەمی (ئەشکانییەکان)دا، بەفەرمانی پاشای ئەشکانی (بلاشی یەکەم ٧٨ - ٥١ پ.ز)، موبیدە (زەردەشت)ییەکان چەند بەشێک لە ئاڤێستایان بەزمانی (پەهلەوی) ئەشکانی لەو خەڵکانە وەرگرتووە، کە ئاڤێستایان لەبەرکردووە، هەروەها هەرچی پەڕەی پەرتوبڵاوی ئاڤێستا هەبووە، کۆیانکردۆتەوە و ڕێنوسێکی تازەیان بۆ داناوە، لەبەر ئەوەی واتای وشەکانی ئاڤێستای کۆنیان نەزانیوە، بەلێکدانەوەی خۆیان واتای تازە و جۆراوجۆریان بۆ وشەکانی ئاڤێستا داناوە، بەو هۆیەوە، کۆمەڵێک وشەی بێ واتا و ناوەڕۆکیان تێکەڵ بە ئاڤێستا کردووە، بێگومان گەلێک لە نەریتە باوەکانی نەتەوەکانی دیکەش کەوتوونەتە ناو ئەو ئایینەوە، بەوشێوەیە ئاڤێستا کۆکراوەتەوە و نووسراوەتەوە.

دیسانەوە لەسەردەمی (ئەردەشێری پاپەکان ٢٢٦ - ٢٤١ز)ی یەکەم پاشای (ساسانییەکان)، بەیارمەتی پیاوانی بەناوبانگی ئایینی و بەتایبەت (تنسر)ی گەورە ڕاوێژکاری پاشا، بۆ جارێکی تر ئاڤێستا نووسراوەتەوە، بەڵام شێوەی دووبارە نووینەوەی ئاڤێستا، ساسانییەکانی ناچارکردووە، کە لەپێکهاتەی ئاڤێستای ئەشکانییەکان لێکدانەوەیەکی نوێ بنووسنەوە، بەنێوی (زەند)[1]. ئەو کاتە تنسر

١. زەند: وشەیەکی کۆنی هەورامییە و بەواتای شرۆڤە و ڕاڤەکردن دێت.

چووه بۆ وڵاتی یۆنان و ئەو بەشە لە ئاڤێستای هێناوەتەوە، کە کاتی خۆی سوپاکەی ئەسکەندەر بە تاڵان بۆ ئەو وڵاتە بردویانە و (٣٤٨) بەشی ماوەتەوە، کە بریتیی بووە لە (٣٤٥٧٠٠) وشە. دوای نووسینەوەی ئاڤێستا، دواتر ئەردەشێر کردویەتی بە ئایینی فەرمی دەوڵەتەکەی، پاشان پەرستگای گەورە و فراوانیان بۆ ئایینەکە دروستکردووە و ئاگری تازەیان داگیرساندوە، ئەو کاتە زوربەی زۆر هەتا پێنج یەکی زەوییە کشتوکاڵییەکانی وڵاتیان پێشکەشی پەرستگاکان کردووە. دواتر لە سەردەمی پاشایەتی (شاپووری یەکەم ٢٤١- ٢٧١ز)ی کوڕی ئەردەشێر، زانستە جۆربەجۆرەکانی ئەو سەردەمەی وەک، (ئەستێرەناسی، پزیشکی، فەلسەفە، مێژوو، جوگرافیا) و هتد..، لە زمانەکانی هیندی و یۆنانی و سریانییەوە وەرگێڕاوە و کردویانە بە پاشکۆی ئاڤێستا.

لە ناوەڕاستی دەسەڵاتداریەتی ساسانییەکاندا و لە سەردەمی پاشایەتی (شاپووری دووەم ٣١٠ - ٣٧٩ز)، لە دوای ساڵانێکی زۆر بۆ شرۆڤەکردن و ڕاڤەکردنی زەند، دیسانەوە ناچاربوون، لێکدانەوەیەکی تر بەنێوی (پازەند) لەسەر ئاڤێستا بنووسن، چونکە ئەو کاتە ناکۆکییە مەزهەبییەکان، بوونەتە هۆی ئەوەی، کە جارێکی تر ئاڤێستا بنووسنەوە و نوێی بکەنەوە، ئەوکارەش بەیەکێک لە شارەزاترین موبیدانی ئایینی (زەردەشت)ی ئەو ڕۆژگارە سپێردراوە، بەناوی (ئازر پاد). لەئێستادا، ئەو زەند و پازەندانە بە ئاڤێستای نوێ دەناسرێن.

ئاڤێستای ڕۆژگاری ساسانییەکان، لە (٢١) بیستویەک بەرگدا نووسراوەتەوە و دواتر ئەو بیستویەک بەرگەیان لە (٣) سێ بەشی جودادا ئامادەکردووە، کە بریتیین لە:

یەکەم: (گاسانیک)، کە لە بارەی پەیدابوونی جیهانەوەیە.

دووەم: (هاتیک)، لە بارەی زانستەوەیە.

سێیەم: (مانسریک)، تایبەتە بە نزا و پاڕانەوە.

ئەو سێ بەشانە، هەربەشەیان (٧) حەوت بەرگی گرتۆتە خۆی.

دوا هەوڵیش بۆ کۆکردنەوە و نوێکردنەوەی ئاڤێستا، لە دەورووبەری سەدەی شەشەمی زایینیی و لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی (کیسرای دووەم ٥٩٠ – ٦٢٨ز) ناسراو بە خوسرەو پەرویزدا بووە، ئەو کاتە شێوەی خەتی (دین دەبیری) هاتۆتە کایەوە. ئەویش جارێکی تر شارەزاترین موبیدانی (زەردەشت)ی ڕاسپاردوە، تاکو پەراوێز و پەرچەڤەیەکی نوێ بۆ ئاڤێستا بکەن و بەو خەتە بینووسنەوە. لێکۆڵەرەوان پێیانوایە، کە ئاڤێستای بچوک یان (خوردە ئاڤێستا) لەسەردەمی ساسانییەکاندا کۆکراوەتەوە، چونکە ساسانییەکان لە سەدەکانی سێیەم هەتا شەشەمی زایینیی، خەریکی کۆکردنەوە و نووسینەوەی ئاڤێستا بوون، ئەوان ئەو کاتە، بە ئاڤێستایان گوتووە (ئاوستاغ). ئاڤێستای سەردەمی ساسانییەکان سێیەک یان چواریەکی ئاڤێستا کۆنەکە بووە. باوەڕوایە کە پاشماوەی ئێستای ئاڤێستا بە ئاڤێستای کۆن و ئاڤێستای نوێوە، یەک لەسەر چواری ئاڤێستای پێش هێرشی عەرەبە موسڵمانەکان بێت، چونکە لەسەردەمی ئەوانیشدا، جارێکی تر بەشێکی ئەو پەڕتوکانەی ئاڤێستا لەناوبراون[1]، چونکە هێرشی عەرەبەکان زۆر لە هێرشەکەی ئەسکەندەر وێرانکەر تر بووە. دوای هێرشی عەرەبە موسڵمانەکان، بۆ سەر وڵاتی ساسانییەکان، لە دەورووبەری سەدەی نۆیەمی زاینیدا، (زەردەشت)ییەکان پەرتوکێکی تریان بەنێوی (دینکرد) نوسیووە، کە ئەو پەرتوکە پڕە لە داستان و ئەفسانەی سەیر و سەمەرە و بێبنەما! ئەو کاتە دینکرد بەشێوەیەکی نهێنی پارێزراوە، هەتا عەرەبە موسڵمانەکان ئاگاداری نەبن. دواتر (زەردەشت)ییەکان لەوە دڵنیا نەبوون، کە ئەو پەرتوکە لە

١. ئیبن خلدون لە پەڕتوکەکەی خۆیدا نووسیوویەتی: کاتێك عەرەبەکان دەوڵەتی ساسانییان داگیرکردووە، پاشماوەی نووسراو و پەڕتوکێکی زۆری ئەو ناوچانەیان کەوتۆتە دەست. لەوکاتەدا (سەعدی کوڕی وەقاس) کە سەرکردەی لەشکری موسڵمانەکان بووە سەبارەت بەو نووسراوانە نامەیەکی نووسیووە بۆ (عومەری کوڕی خەتاب) کە ئەوکاتە عومەر خەلیفەی دووەمی ڕاشدینییەکان بووە، ئەویش لە وەڵامدا بۆی نووسیووە، هەموویان بسوتێنن یان بیانخەنە ناو ئاوەوە، چونکە ئەگەر ئەو پەڕتوکانە ئامۆژگاری کەربن ئەوا خوای گەورە لە ئەوان ئامۆژگاری کەر ترە. ئەگەر گومڕا کەریش بن پێویستە خواوەند لە شەڕیان بیان پارێزێت.

خاکی فارسەکاندا بمێنێتەوە، لەبەر ئەوە بردویانە بۆ وڵاتی هیندستان، ئێستا بە پارێزراوی لەو وڵاتە ماوەتەوە.

لە ساڵی (١٧٧٠ز)، زمانەوانی بەناوبانگی فەرەنسی (ئەنکیتل دوپرۆن)، دوای هەوڵ و کۆششێکی (٢٠) بیست ساڵە، ئاڤێستای وەرگێڕاوە و لە دوو بەرگدا چاپی کردووە. شایانی باسە ئێستا کۆنترین دانەی ئاڤێستا، لە وڵاتی (دانیمارک)ە، کە لە (٨٣٠٠٠) وشە پێکهاتووە.



**بڵاوبوونەوەی ئایینی زەردەشتیی**

## بەشەکانی ئاڤێستا

لە ئێستادا، ئاڤێستا (٢١) بیست و یەک پەڕاوە، کە لە (٥) بەش پێکهاتووە. بەو شێوەیە: (یەسنا، یەشت، ڤیسپرد، ئاڤێستای بچوک یان خوردە ئاڤێستا و ڤەندیداد). ئەلف و بێیی ئاڤێستا، لە (٤٨) پیت پێکهاتووە. ئەوەی ئێستا لەبەردەستی (زەردەشت) ییەکاندایە بریتییەلە:

**یەکەم/** یەسنا: سەرەکی ترین و گرنگترین بەشی ئاڤێستایە، وشەی یەسنا واتە: (ستایش و پەرستن). بەندەکانی ئەو بەشە، بەپێیی پێویست لە کاتی جۆراوجۆر و رێورەسمە ئایینیەکاندا، لەلایەن دوو موبید خوێندراونەتەوە. کۆی بەشەکانی یەسنا: بریتییە لە (٧٢) نامیلکە، هەر یەک لەو نامیلکانە بەناوی (هایتیی)، واتە، پەیوەند دەناسرێن، کە کۆمەڵە سروودێکن تایبەت بە دادپەروەری و پەرستنی ئاهورامەزدا نووسراون. لەو حەفتاو دوو بەشەی یەسناش، حەڤدە (هات)[1] بەشیان بە ناوی (گات) ەکانەوە ناسراون، کە لە (٨٩٦) ڕستە و دێڕ پێکهاتوون، ئەوانیش بەگشتی لە (٥٥٦٠) وشە دروستبوون، کە ئەو حەڤدە بەشە، لە (٢٣٨) (هۆرە) یان سروود پێکهاتوون. ئەو گاتانە وتراوەکانی پەیامبەر (زەردەشت) خۆنی، بە ناوی سروودە ئایینیەکان کەلەبەردەم ئاهورامەزدادا گوتوونی و کۆنترین بەشی ئاڤێستان، بەڵام لێکۆڵەرەوان لەوبارەیەوە هاوبیرنین، چونکە گشت سروودەکان بەهەڵبەستی خودی (زەردەشت) نازانن، بەڵکو هەندێکی بەهەڵبەستی موبید و شاگردەکانی (زەردەشت) ی دادەنێن، کە لەدوای (زەردەشت)ەوە هەتا کۆتایی دەوڵەتی ساسانی و پێش هاتنی سوپای ئیسلام، بۆ سەر وڵاتی ساسانی نووسیوویانەتەوە. بەوشێوەیە بەشی یەکەم، لە گاتەکان سروودەکانی خودی (زەردەشت)ن و بە ئاڤێستای کۆن ناسراون. بەشی دووەم بە ئاڤێستای نوێ دانراوە، کە ڕاڤەکردنەوەی گاتەکانە، بەهەمانشێوە گاتەکانیش دەکرێن بە (٥) پێنج بەشەوە:

١. هات: بەزمانی ئاڤێستایی واتا کەرت یان بەش.

١. ئاهونەڤەد گات: بریتییە لە (٧) نامیلکە یان حەوت هاتی یەسنایی، کە بریتییە لە هاتەکانی (٢٨-٣٤)، لە (٣٠٠) دێڕ و (٢١٠٠) وشە پێکهاتوون.
٢. ئوشنەڤەد گات: بەگشتی بریتییە لە (٤) هات، ئەویش هاتەکانی (٣٤-٤٦)، کە لە (٣٣٠) دێڕ و (١٨٥٠) وشە پێکهاتوون.
٣. سپینتامەینۆ گات: (٤) بەشە، بەشی (٤٧-٥٠)، بریتییە لە (١٤٦) دێڕ و (٩٠٠) وشە.
٤. ڤوهوخشەترە گات: (١) بەشە، کە ئەویش بەشی (٥١)، بریتییە لە (٦٦) دێڕ و لە (٤٥٠) وشە پێکهاتووە.
٥. ڤەهیشتریشتی گات: (١) بەشە، کە ئەویش بەشی (٥٣)، بریتییە لە (٣٦) دێڕ و (٢٦٠) وشە.

کۆی گشتی گاتەکان بریتییە لە (١٧) هات و (٨٧٨) دێڕ و (٥٥٦٠) وشە.

**دووەم/** یەشت: یەشتەکانیش تایبەتن بەستایشی ئاهورامەزدا، تائێستا (٢١) یەشت ماوە، کە هەریەشتەی بریتییە لە نامیلکەیەکی دیار و خاوەن ناوەڕۆک و بیروبۆچوونی تایبەت. هەربەشێکیان لە دەربارەی ستایشی یەکێک لە (ئەمشاسپندان) فریشتەیەک دایە و لە کاتێکی تایبەتدا خوێنراونەتەوە. یەشت وشەیەکی ئاڤێستاییە، بەمانای (پاڕانەوە) دێت، کە لەسەرەتاوە وەک هۆنراوە ڕێکخراون، بەڵام دواتر چەندین بەشی تریشی خراوەتە سەر. بەهەمان شێوەی گاتەکان، یەشتەکانیش (زەردەشت) خۆی فەرمووني. هەندێک لە لێکۆڵەرەوان لەگەڵ وشەی (یاسین) ی قورئان بە هاوکێشی یەکتریان دەزانن. ئەویەشتانەی کە تاوەکو ئێستا ماونەتەوە، بەگرنگترین بەشەکانی ئاڤێستا دانراون.

**سێیەم/** ڤیسپرد: واتە، مانەوەی ژیانی سەروەران، هەروەها وێردی جوتیارانیشیان پێدەگوترێت. ئەو بەشەی ئاڤێستاش لە بنچینەدا ستایش نامەیەکە، لەبەردەم بارەگای ئاهورامەزدادا، هەروەها لە بارەی جەژن و ڕێوڕەسمە ئایینیەکانەوە پەیوەندداره، کە ئەویش بریتییە لە (٢٤) بەش و (٣٣٠٠) وشە.

**چوارەم/** ئاڤێستای بچوک (خوردە ئاڤێستا): بەزمانی پەهلەویش پێیدەگوترێت (خورتک ئاڤێستا)، ئەویش بریتییە لە باسی (داد، یاسا، چۆنیەتی دەسەڵاتداری، زانست، هونەر و پیشەکانی سەردەم، گەردونناسی، جەژنەکان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان)، هەروەها نزا و پاڕانەوە و نوێژ، کە لەسەردەمی شاپووری دووەمدا، بەیارمەتی ئازرپاد لەبەشەکانی تری ئاڤێستا وەرگیراوە و کۆکراوەتەوە و نووسراوەتەوە.

**پێنجەم/** ڤەندیداد: لە ئاڤێستای ئێستادا، ڤەندیداد دوابەش و پێنجەم بەشە، ڤەندیداد واتە، (ڤیدای ڤاداتا) یاسای دژی دێو یاخود بە دێوبەندیش دێت، کە یەکێکی ترە لە بەشە گرنگ و بنچینەییەکانی ئاڤێستا و بریتییە لە (٢٢) بەش. لە ڤەندیداددا، یاسا و دەستوری مەزهەب و بنەماگانی سزادانی هەردوو دنیای تێدایە، بە زۆری یاسای سزادانی دژی تاوانبارانی تێدا پێشبینی کراوە، وەکو قامچی لێدان و لەناوبردنی مار و مێرووی زیانبەخش و پاداشتی کارە چاکەکان لەو بەشەدا هاتووە. هەروەها بەشی (١٩)ی ڤەندیداد تایبەتە بەباسی لەدایکبونی (زەردەشت) و نەبەردی ئەو دژی ئەهریمەن. لێکۆڵەرەوان ئەوبەشەی ڤەندیداد بەدروستکراوی سەردەمی ئەشکانییەکان دەزانن، هەروەها لێکۆڵەرەوان پێشیانوایە کە بەشی (١٦) لە کۆتایی سەردەمی ئەشکانییەکاندا دروستکراوە.

## نوێژ لە ئایینی (زەردەشت) دا

لە ئایینی (زەردەشت)یدا لە ڕۆژێکدا (٣) سێ نوێژ لەکاتەکانی (بەیانی، نیوەڕۆ و ئێوارە)دا ئەنجام دەدرێن، هەریەک لەو نوێژانە لە (٤) چوار بەش پێکدێن، کە تیایاندا ستایشی ئاهورامەزدا دەکرێت. دوای دەستنوێژگرتن، نوێژکەر بەرەو ڕۆشناییەک ڕادەوەستێت، چونکە ئاهورامەزدا جێگای هەمیشەیی نییە.

نوێژەکانیش بەو شێوەیەی خوارەوەن:

*نوێژی بەیانی:*

خشتەترە ئاهورامەزدا.

بەشادی ئاهورامەزدا و بەناوی ئاهورامەزدای بەخشندە.

ئاشم و هووە هیشتم ئاستی.

بەخشندەی میهرەبان و پاکی و ڕاستی.

ئاوشتا ئاستی ئاوستا ئاهمایی.

باشترین چاکەیە و مایەی کامەرانییە.

هیت ئاشانی و هیشتانی ئیشم.

کامەرانی بۆ کەسێک کە ڕاست و خواستی باشتریین ڕاستییە.

*نوێژی نیوەڕۆ:*

خشتەترە ئاهورامەزدا یەتائاهوئی ریو.

بەشادی ئاهورامەزدا بەناوی ئاهورامەزدای بەخشندە.

ئاتار توشی ئاشان چیت هچاونگهوش درزدا منگتهو.

بەخشندەی میهرەبان کە ئەوە سەرداری جیهان (ئاهو) بەتوانا و لێهاتووە.

شیئون نیم ئانگئوش مزدائی.

هەر ئەوە سەرداری ئایین (ڕتورد).

خشترم چائاهورایی ئایم دریگوبی وددت واستارم.

بەهۆی پاکی و چاکی خۆی بەتوانایە دانەری بیری باشە (وهومن).

*نوێژی ئێوارە:*

ینگهە هاتم ئائیت یسن.

مەزدا ئاهورا ئاگادارە لەو کەسەی.

بئیتی ونگهو فرداد ئاهورو.

چ پیاو چ ژن

ونشا ئاشات هچا یاونگ.

کە زیاتر و باشتر بەشێوەی ڕاست ستایش دەکات

همچا تچا تاوسچا یزد منید.

ستایشی ئەو پیاو و ژنانە دەکەین.

هەروەها لە ئایینی (زەردەشت)یدا و لە دواین مانگی هەموو ساڵێکدا، لەسەر باوەڕداران پێویستە کە (٣٠) سی ڕۆژ پێش بەرەبەیان هەتا ئاوابوونی خۆر دوور بکەونەوە لە خواردن و خواردنەوە، واتا، بە ڕۆژوو بن، بەڵام ئەو ئەرکە لەسەر ئەوانە پێویست نییە کە بەهۆی نەخۆشی یان گەشتکردن یاخود کارکردن و پەیداکردنی بژێوی ژیانەوە سەرقاڵن. هەروەها هەندێکی تر لە ئەرکە ئایینیەکانی تری (زەردەشت)ییەکان، پێش خەوتن و دوای هەڵسانی بەیانیان و کاتی خۆشۆردن و خواردن و دوای دەرچوون لە سەرئاو و کاتی پژمین و سەرچاککردن (قژ بڕین) و نینۆککردن و چرا داگیرساندن، پێویستە لەوکاتانەدا چەند وێرد و نزایەک بخوێنرێتەوە.

## ئاگر لە ئایینی (زەردەشت)دا، پەرستگەی (زەردەشت)ییەکان

ئاگر یەکێکە لە چوار بنەما پاک و پیرۆزەکەی ئایینی (زەردەشت)، پاراستنی لە پیسی، یەکێکە لە بنەما گرنگەکانی ئەو ئایینە. لە ئایینی (زەردەشت)دا، پیرۆزترین ئاگر، ئەو ئاگرەیە، کە لە (١٦) ئاگری جۆراوجۆری تر، کە هەریەکێکیان بە جۆرێک ئامادەکرابێت وەک لەیەکخشاندنی دووبەردە چەخماخ، یان لە ئاگری تایبەتی پەرستگەکان و ماڵە پیرۆزەکان، کە بەدەستی پیاوچاکان داگیرسابێت، ئاگرەکە دەکەنەوە. بەو شێوەیەی خوارەوە:

ئەرکی کردنەوەی ئاگری پیرۆز، لە پەرستگەکاندا، لە ئەستۆی موبیدەکاندایە، ئەوان دەبێت هەمیشە لە پەرستگەکاندا بەوردی چاودێری کاروباری ئایینی و شێوازی پاککردنەوە و شۆرین بکەن. ئەو موبیدانە بەشێکی زۆری ئاڤێستایان لەبەردایە. سەکۆ و ئاگردانی پەرستگە (زەردەشت)ییەکان، کە هەمیشە پڕە لە خۆڵەمێش، لە ناوەڕاستی ژووری پەرستگەکەدا هەڵکەوتووە، ئەو ژوورە هەموو کاتێک بە بۆنی بخورد و ڕووەکە بۆندارەکان، بۆنخۆش دەکرێت[1].

(زەردەشت)ییەکان دوای بڵاوبوونەوەی ئایینەکەیان، لەزووربەی شوێنەکاندا، پەرستگەیان دروستکردووە، لە ناوەوەی پەرستگەکانیشدا، ئاگردانێکی تایبەتیان بۆ ئاگرکردنەوە دروستکردووە، چونکە لە ئایینی (زەردەشت) دا، ئاگر بەنیشانەی پرشنگ و بڵێسەی خۆر دادەنرێت، خۆریش بەسەرچاوەی ڕوناکی و ژیان دەزانرێت، هەروەها لەوئایینەدا، ئاگر هێمای خواوەند ئاهورامەزدایە. موبیدە (زەردەشت) ییەکان بۆ ئەو مەبەستە چەند لقەدارێکی (سەندەل)ی بۆندار و داتاشرا و کۆدەکەنەوە و کڵاوڕۆژنەیەکی بچوک لە نێوان دارەکاندا دەهێڵنەوە، بۆ ئەوەی لەوێوە وردکراوی داری سەندەل بکەنە ناو پارچەدارەکانەوە، لەوکاتەدا، موبیدەکان دەسرێکیان بەدەمیانەوە بەستووە،

١. لەناو شاری تاراندا هەتا ئێستاش پەرستگەی (زەردەشت) ییەکان ئاگری تیادا داگیرساوە.

بۆ ئەوەی هەناسەیان بەرئاگرەکە نەکەوێت و پیسی نەکات، هەروەها خۆشیان لە پژمە و کۆکە دەپارێزن. موبیدەکان بەبێ ئەوەی خۆیان دەست لە ئاگرەکە بدەن دایدەگیرسێنن، ئینجا بە پارچە ئاسنێک چاودێری لێدەکەن. پاشان (٩١) جار نزا و سرووده ئایینیەکان دەخوێننەوە. (زەردەشت) ییەکان ڕۆژانە (٣) جار نوێژدەکەن و ڕووو لەو ئاگرەدەکەن، کە دایانگیرساندوە، ئەوان بڕوایان وایە، کە ئاگر تیشکی ئاهورامەزدایە، نەک ئەوەی کە بەخودی ئاهورامەزدای تاک و تەنیای بزانن.

باوەڕدارانی (زەردەشت)ی هەر کاتێک بیانەوێت دەتوانن بچنە ناو پەرستگەکەیان، بەڵام پێش چوونە ژوورەوەی پەرستگە، دەبێت دەموچاویان پاک بشۆن دواتر بەشێکی ئاڤێستای پیرۆز بەتایبەت نزاکان بخوێننەوە، لەدوایدا، پێڵاوەکانیان دادەکەنن، ئینجا دەچنە ژووری پەرستگەکەوە و دیاری و هەندێک پارچە داری سەندەل پێشکەش بە موبیدەکانی پەرستگەکە دەکەن. لەبەرامبەر ئەوەشدا، هەریەکەیان کەوچکێک خۆڵەمێشی ئاگری پیرۆز وەردەگرن، کە ئەوخۆڵەمێشە پیرۆزە، بەنیازی بەدەست هێنانی گەورەیی و بەزەیی لە ڕوخساری خۆیانی دەسوون، لەدوایدا، ڕووەو ئاگرەکە سەری ڕێز دادەنەوێنن و نوێژ و نزاکانیان دەخوێننەوە. دواتر بەهێواشی پشتاوپشت دەڕۆنە دەرەوەی پەرستگەکە.

## جەژنی زەردەشتییەکان

لەناو (زەردەشت) ییەکاندا چەندین جەژن و بۆنەی تایبەتی ئایینی هەیە، بەڵام جەژنی گەورە و گرنگی (زەردەشت)ییەکان، ئەو جەژنەیە، کە لە مانگی (نەورۆز) خاکەلێوەدا، ماوەی (١٠) ڕۆژ دەخایەنێت. خەڵک بەگشتی لەو ڕۆژانەدا دەست لە کار و ئیشکردن هەڵدەگرن، لەوکاتەدا، (زەردەشت)ییەکان لەسەر شاخەکان ئاگردەکەنەوە و ڕێورەسمێکی تایبەت ئەنجام دەدەن. ئەو ڕۆژە (زەردەشت) ییەکان زوو لەخەو هەڵدەستن، خۆیان دەشۆن و بەرگی نوێ لەبەردەکەن، دواتر سەردانی ئاتەشگەکان دەکەن، ڕێورەسمی نزا و پاڕانەوە بەڕێوە دەبەن. لە تەواوی ئەو ڕۆژە پیرۆزەدا، (زەردەشت) ییەکان بە سەردانی خزمان و ناسیا و دراوسێکانیان بە ئاڵوگۆڕی دیاری شرینی دابەشکردن و چۆنی و چاکی و گەردن ئازادی پیرۆزبایی و جەژنانە بەدڵێکی خۆش و شادەوە ڕۆژەکە بەسەردەبەن. لەئێستادا (زەردەشت) ییەکان ئەگەر کەسێک بە (زەردەشت)ی لەدایک نەبێت، ئەوا ڕێگەنادەن هیچ کەسێک بچێتە ناو ئایینەکەیانەوە.

## چۆنیەتی ژن مارەکردن لە ئایینی (زەردەشت) دا

بەپێی ئامۆژگارییەکانی (زەردەشت)، هەر کچێک یان هەر ژنێک بەرگری لە شوکردنی نەکردبێت، دەتوانرێت لەلایەن پیاوانەوە داوای هاوسەرگیری لێبکرێت، چونکە لە ئایینی (زەردەشت) دا، ڕەزامەندی ژن و پیاو بۆ پێکهێنانی هاوسەرگیری، یەکێکە لە بنچینە سەرەکییەکان. لە ئامۆژگارییەکانی (زەردەشت)دا هاتووە، کە ڕێورەسمەکانی دەزگیران دیاریکردن لەکاتێکدا دەتوانرێت ئەنجام بدرێت، کە کچەکە تەمەنی لە (١٤) چواردە ساڵ کەمتر نەبێت و کوڕەکەش تەمەنی لە (١٦) شازدە ساڵ کەمتر نەبێت. ئەو ڕێورەسمە بە ئاڵوگۆڕی ئەلقە و دیاری و بەئامادەبوونی خزمانی هەردوو لا، کە بەلانی کەمەوە لە (٧) حەوت کەسی باوەڕپێکراوی (زەردەشت)ی، کە تەمەنیان لە (٢٥) بیست و پێنج ساڵ کەمتر نەبێت، ئەنجام دەدرێت. دوای

ژنەکەی بۆی هەیە، پیاوەکە بداتە دەست دادگا و داوای جیابوونەوەی لێبکات.
ڕازیبوون و ڕەزامەندی بەدەستهێنانی کچەکە و باوک و دایکی کچەکە، بەو جۆرەی
لەگەڵ ئەوانەشدا، لە ئایینی (زەردەشت) یدا، چەند شتێکی تریش هەیە، کە دەبنە
خوارەوە ڕێوڕەسمەکە بەڕێوە دەچێت:
هۆی جیابوونەوەی هاوسەرگیریی لەوانە، ئەگەر هاتوو ژنەکە دوژمن بشارێتەوە
کۆمەڵێک لە خزمە نزیکەکانی کوڕەکە، دەچن بۆ ماڵی باوکی کچەکە، لەگەڵ خۆیان
و مێردەکەی ئاگادارنەبێت، یان جادو و جادوکاری بکات، یاخود فێری ببێت.
نامەیەکی کوڕەکە دەبەن بۆ باوک و دایکی کچەکە، کە لەسەر کاغەزێکی سەوز
هەر کاتێک بۆ ماوەی (٣) ساڵ هاوسەری ژنەکە لە رووی داراییەوە پێداویستی
نووسراوە. مەبەستیش لەو کارە، ئەوەیە لە کاتی بەیەکگەیشتنی بوک و زاوا لە
بۆ ژنەکەی دابیننەکرد، یاخود ئەگەر هاتوو مێردەکە بۆ ماوەی (٥) ساڵ دیار
داهاتوودا، بۆ ئەوەی لە ژیانێکی پیرۆز و خۆشبەختیدا بەهرەمەندبن.
نەمابێت، یان پیاوەکە لە پیاوەتی کەوتبێت. ئەوانەش دەبنەهۆی جیابوونەوەی
چەند ڕۆژێک دوای ئەوە، لەلایەن خزمانی پلەیەکی بنەماڵەی کچەکەوە، وەڵامی
هاوسەرگیریی، لە ئایینی (زەردەشت)یدا.
نامەکەی زاوا دەنووسرێتەوە و دەبرێت بۆ ماڵی کوڕەکە.

دواتر لەلایەن بنەماڵەی کوڕەکەوە، (ئەڵقەیەک، سینییەک نوقڵ، چەند کەللە

شەکرێکی و (کشتی) پشتێن بەستن) لە ئایینی (زەردەشت) دا ئامادەدەکرێت، لە
ڕێوڕەسمی

ڕێوڕەسمێکی دیاریکراودا، ئەو کەلوپەلانە دەبرێن بۆ ماڵی کچەکە. ئەڵقەکە لەلایەن
ئەو نەریتە لەپێش (زەردەشت) ەوە لەناو ئارییەکاندا باوبووە، دواتر (زەردەشت)
خزمێکی نزیکی کوڕەکە، واتە، زاواوە، دەکرێتە پەنجەی کچەکەوە و پیرۆزبایی لە
پەیامبەر بڕیاری فەرمی لەسەرداوە. لەئایینی (زەردەشت) دا، کشتی یان پشتێن
یەکتری دەکەن. دواتر بەمەبستی مارەکردنی کچ و کوڕەکە (هربد)[1]، کە پێشەوایەکی
بەستن نیشانەی بەندایەتی ئاهورامەزدایە، کە پشتێن لەسەر کراسی ئایینیەوە
ئایینیە لەگەڵ چەند کەسێک لە خزمان و میوانانی زاواکە، کە نابێت ژمارەیان
دەبەسترێتەپشت، یەکێکە لە ئەرکە سەرەکییەکانی ئەو ئایینە و دەبێت
لە (٧) حەوت کەس کەمتر بێت، بەمەبەستی مارەبڕینی بوک، دەچن بۆ ماڵی
(زەردەشت) ییەکان لە هەموو کاتێکدا، ئەو پشتێنەیان لەپشت بێت، چونکە لە
باوکی کچەکە، بۆ ئەو مەبەستە، بوکەکە پێشتر خۆی ئارایشت دەکات، لە لای
ئایینی (زەردەشت) یدا، نەبەستنی پشتێن، یەکێکە لە تاوانە گەورەکان. لە کاتێکدا
سەرووی ژوورەکەوە دادەنیشێت و پارچەیەک کوتاڵی سەوز بەسەری خۆیدا دەدات،
منداڵی کوڕ دەگاتە تەمەنی (٧) ساڵی، دەبێت پشتێن ببەستێت. لەسەردەمی
بەشێوەیەک کە ڕوخساری دیارنەبێت. چەند ژنێکی تر، لە هەردوو تەنیشتی
ژیانی (زەردەشت) دا، (زەردەشت) ییەکان بەنی پشتێنەکەیان لە خوری مەڕ و
بوکەکەوە دادەنیشن. ئینجا هربد و هاوڕێکانی، لەکاتێکدا، کە چەند چرایەکی
موی بزن و لۆکە دروستکردووە، بەڵام ئێستا پشتێن لە خوری مەڕ دروستدەکەن.
داگیرساویان بەدەستەوەگرتووە، بە ئاهەنگی گۆرانی دەچنە ژوورەوە، لەبەردەم
دواتر لە ڕێوڕەسمێکی تایبەتدا و بەخوێندنەوەی چەند بەشێک لە ئاڤێستای پیرۆز،
بوک پێشەوا ئایینیەکە، لە کچەکە دەپرسێت: (بەناوی خوا تۆ ئەی کچی.....لێت
کە لەلایەن موبیدێکەوە دەخوێنرێتەوە، پشتێنەکە لە پشتی منداڵەکە دەبەسترێت.
دەپرسم، ئایا بەژن و مێردی لەگەڵ کوڕی..... ڕازیت).
ئەو پشتێنە لە (٧٢) تاڵە بەنی خوری سپی، کە لەلایەن ژنی موبیدێکەوە

دەهۆنرێتەوە، پێکهاتووە. لە ئایینی (زەردەشت) دا، ئەو حەفتاو دوو تاڵە بەنە،
١. هربد: لە ئایینی (زەردەشت) یدا کاروباری دادوەری و سەرپەرشتی بۆنەی هاوسەرگیری و تەرم
ڕێکخستن و ئاهەنگە ئایینیە جیاوازەکان دەکەن.

**پێنجەم/** خودسەرژن: خود واتا (بڕیار، سەربەست و سەربەخۆ)، کچ لەتەمەنی (١٦)ساڵی و کوڕ لە تەمەنی (١٨) ساڵیدا بەبێ ڕەزامەندی دایک و باوکیان بەیەک دەگەن و هربد مارەیان دەبڕێت. لەناو (زەردەشت) ییەکاندا هەرکاتێک کچێک و کوڕێک دەگەنە تەمەنی یاسایی هاوسەرگیریی، دەتوانن داوای هاوسەرگیریی بکەن، بەڵام ئەگەرهات و باوک و دایکی کچەکە بەهەرهۆیەکەوە بەوهاوسەرگیرییە ڕازی نەبن ئەوکاتە بەپێچەوانەی ئارەزووی دایک و باوکیانەوە دەتوانن بڕیاری خۆیان بدەن، چونکە نەبوونی ڕەزامەندی باوک و دایکی کچەکەو کوڕەکەش نابێتە هۆی ڕێگری هاوسەرگیرییەکەیان. دواتر بەپێیی یاسا کچەکە لەهەموو شتێکی ماڵی باوکی بێبەش دەکرێت مەگەر خودی دایک و باوکەکە بەنووسین ڕەزامەندبن.

## مەرجەکانی جیابوونەوەی هاوسەرگیری، لە ئایینی (زەردشت) دا

لە ئایینی (زەردەشت) دا، ژنهێنان و هاوسەرگیری یاسا و ڕێسای هەمیشەیی هەیە، بە هیچ جۆرێک جیابوونەوە و دابڕان لە نێوان هاوسەرەکاندا ڕێگەی پێنەدراوە، بەڵام لەو ئایینەدا (٤) هۆکار دەبنە هۆی لێکجیابوونەوەی هاوسەرگیری:

١. تەنها لە کاتێکدا، کە ژنی یەکەم نەخۆشی درێژ خایەنی هەبێت، یان منداڵی نەبێت.

٢. هەر کاتێک دەرکەوت کە یەکێک لە هاوسەرەکان نەخۆشی دەروونی هەیە، بەڵام لایەنی بەرامبەر لە کاتی بەستنی هاوسەرگیریدا ئاگادار نەبووە، بە داواکاری لایەنی تەندروست ئەو پەیمانە هەڵدەوەشێتەوە.

٣. هەر کاتێک ژنەکە یان پیاوەکە لە ئایینی (زەردەشت)ی وازیانهێنا، ئەو کاتە جیابوونەوە پێویستە.

٤. هەر کاتێک سەلمێنرا، کە ژنەکە کاری ناپاکی و خیانەتی هاوسەرگیریی ئەنجامداوە، ئەو کاتە هاوسەری دووەم بۆی هەیە، داوای جیابوونەوە بکات، یان بەپێچەوانەوە، ئەگەر پیاوەکەش لەگەڵ ژنێکی تردا بەدڕەوشتی بکات، ئەو کاتە

## جۆرەکانی پێکهێنانی هاوسەرگیری، لە ئایینی (زەردەشت) دا

پەیامبەر (زەردەشت) هیچ کاتێک فرە ژنی قبوڵ نەکردووە، فەرمانی بە هێنانی یەک ژن داوە، ئەوانەی کە لە پەیڕەوکەرانی ئایینی (زەردەشت) بوون، مافی ئەوەیان نەبووە، لەیەک ژن زیاتر بهێنن. (زەردەشت) لەئایینەکەیدا، ئازادی تەواوی داوە بەژن، کە بەئارەزووی خۆی هاوسەری ژیانی هەڵبژێرێت، سەلماندنی ئەو ڕاستییەش، نمونەی بە شودانی پوروچیستای کچی پەیامبەر (زەردەشت) خۆیەتی. هیچ کاتێک (زەردەشت)ییەکان نەیانهێشتووە کە کچەکانیان بەبێ مێرد و شوکردن بمێننەوە، ئەوەش لەبەر ئەوە بووە، کە کۆمەڵگە و سەربازە شەڕکەرەکان پێویستیان بەوە هەبووە، واتە، پێویستی شەڕ وایکردووە و (زەردەشت)یش یاسای تایبەت بەو مەبەستەی بۆ دەرکردووە، بۆ ژن، کوڕی (مام، خاڵ و پور)، هەروەها کوڕی باوەپیارە و کوڕی باوەژن یان کوڕێک، کە لە هەمان ماڵدا بەخێوکرابێت، یاخود کوڕ و کچ کە لەگەڵ یەکتریدا شیریان خواردبێت، بە برا و خوشک دادەنرێن و نابێت ئەوانە لەگەڵ یەکتریدا هاوسەرگیری بکەن، کە بۆ پیاویش بەهەمان شێوەیە.

لە ئایینی (زەردەشت)دا، پەیوەندی هاوسەرگیری لە ژێر (٥) ناوی جۆراوجۆردا لە تۆماری فەرمی هاوسەریدا بەوناوانە تۆمارکراون: (پاشاژن، چاکەر- کارەکەرژن، ئەیوک ژن، سترەژن و خودسەرژن).

چۆنیەتی پێکهێنانی هاوسەرگیری، لەژێر ئەو ناوانەدا، بەو شێوەیەی خوارەوە ئەنجام دەدرێت:

**یەکەم/** پاشاژن: لەکاتێکدا، کچ دەگاتە تەمەنی شوکردن، بەڕاوێژ و بەباشزانینی دایک و باوکی، لە کوڕێک مارەدەکرێت، ئەو کاتە ئەو هاوسەرگیرییە بە پاشاژن ناودەبرێت، بەوناوە لە تۆماری فەرمی هاوسەرگیریدا تۆماردەکرێت.

**دووەم/** چاکەرژن: چاکەر(کارەکەر)، ئەو شێوە هاوسەرگیرییە لەکاتێکدا ئەنجام دەدرێت، کە پیاوێک لە ژنی یەکەمی منداڵی نەبێت، ئەوکاتە بەڕەزامەندی هاوسەرەکەی، ژنێکی تر دەهێنێت، ئەو کاتە ژنە نوێیەکە، وەک کارەکەری ژنی

یەکەم دەبێت، هەروەها ئەگەر بێوەژنێک دوای مردنی مێردەکەی، لە کەسێکی تر مارەکرا، ئەوا ئەو پەیوەندی هاوسەرگیرییەش، لەژێرناوی چاکەرژن تۆمار دەکرێت. لەوبارەیەوە (زەردەشت) ییەکان باوەڕیان وایە، کە لەجیهانەکەی تردا، ئەو ژنە دەبێتەوە بە هاوسەری مێردی یەکەمی.

**سێیەم/** ئەیوک ژن: کچێک کە برای نەبێت و تەنیا باوکی هەبێت، دوای شوکردنی، یەکەم کوڕێک کە لە بەشودانی ئەو کچەدا پەیدادەبێت، بەکوڕی باوکی ژنەکە دەژمێردرێت، بۆ ئەوەی باوکی کچەکە وەجاخ کوێرنەبێت، ئەو شێوازەش بەناوی ئەیوک ژن، کە ئەو دەستەواژەیە پەهلەوییە و بەواتەی یەک دێت تۆماردەکرێت.

**چوارەم/** سترەژن: سترە واتە، (نەزۆک)، لە ڕۆژگاری کۆندا، ئەگەر پیاوێک مردبایە و کوڕی نەبوایە و ژنی هەبوایە، دەبوایە ژنەکەی بدرایە بە خزمێکی، ئەگەر ژنیشی نەبوایە، ئەوا کچێکی دەدرا بە نزیکترین خزمی، لە ژێرناوی سترژن، ئەگەر ژن و کچیشی نەبوایە، ئەوا خزمەکانی خوشکێکیان لە ژێر ناوی سترژنەوە ،کردووە بەبوک و داویانە بەشوو، دواتر ئەگەر خوشکەکەی کوڕێکی بووە، ئەو کوڕەیان بە کوڕی کابرای مرد و داناوە. لەڕاستیدا کابرای مرد و خاڵی کوڕەکە بووە، بەڵام لێرەدا بە باوکی مردوەکە دانراوە[1]. ئەگەرهاتوو کابرای مرد و خوشکیشی نەبوو، ئەوا ئەو کاتە لە سامانی تایبەتی خودی مردوەکە، خزمەکانی لەسەر خەرجی پیاوەکە و بەناوی سترژنەوە، ژنێکیان بۆخزمێکی مردوەکە هێناوە، تەنیا مەرجی ئەو ژن و مێردایەتییەش ئەوە بووە، کە هەردووکیان واتە، ژن و پیاوەکە پەیمانیان داوە، یەکێک لە کوڕەکانی خۆیان، بە کوڕی کابرای مرد و دابنێن و پێیی ببەخشن، واتە، منداڵەکە بووە بەمیراتگری کابرای مردوو، بۆ ئەوەی کابرای مرد و لە وەجاخ کوێری ڕزگاری ببێت، چونکە (زەردەشت) ییەکان وەجاخ کوێرییان بەکارێکی زۆر خراپ داناوە.

......................................................................

١. ئێستا ئەو هاوسەرگیرییە بەهەڵە دانراوە، کە دەڵێن (زەردەشت) ییەکان خوشکی خۆیان مارەکردووە. (نووسەر).

**پێنجەم/** خودسەرژن: خود واتا (بڕیار، سەربەست و سەربەخۆ)، کچ لەتەمەنی (١٦)ساڵی و کوڕ لە تەمەنی (١٨) ساڵیدا بەبێ ڕەزامەندی دایک و باوکیان بەیەک دەگەن و هربد مارەیان دەبڕێت. لەناو (زەردەشت) ییەکاندا هەرکاتێک کچێک و کوڕێک دەگەنە تەمەنی یاسایی هاوسەرگیریی، دەتوانن داوای هاوسەرگیریی بکەن، بەڵام ئەگەرهات و باوک و دایکی کچەکە بەهەرهۆیەکەوە بەوهاوسەرگیرییە ڕازی نەبن ئەوکاتە بەپێچەوانەی ئارەزووی دایک و باوکیانەوە دەتوانن بڕیاری خۆیان بدەن، چونکە نەبوونی ڕەزامەندی باوک و دایکی کچەکەو کوڕەکەش نابێتە هۆی ڕێگری هاوسەرگیرییەکەیان. دواتر بەپێیی یاسا کچەکە لەهەموو شتێکی ماڵی باوکی بێبەش دەکرێت مەگەر خودی دایک و باوکەکە بەنووسین ڕەزامەندبین.

## مەرجەکانی جیابوونەوەی هاوسەرگیری، لە ئایینی (زەردەشت) دا

لە ئایینی (زەردەشت) دا، ژنهێنان و هاوسەرگیری یاسا و ڕێسای هەمیشەیی هەیە، بە هیچ جۆرێک جیابوونەوە و دابڕان لە نێوان هاوسەرەکاندا ڕێگەی پێنەدراوە، بەڵام لەو ئایینەدا (٤) هۆکار دەبنە هۆی لێکجیابوونەوەی هاوسەرگیری:

١. تەنها لە کاتێکدا، کە ژنی یەکەم نەخۆشی درێژ خایەنی هەبێت، یان منداڵی نەبێت.

٢. هەر کاتێک دەرکەوت کە یەکێک لە هاوسەرەکان نەخۆشی دەروونی هەیە، بەڵام لایەنی بەرامبەر لە کاتی بەستنی هاوسەرگیریدا ئاگادار نەبووە، بە داواکاری لایەنی تەندروست ئەو پەیمانە هەڵدەوەشێتەوە.

٣. هەر کاتێک ژنەکە یان پیاوەکە لە ئایینی (زەردەشت)ی وازیانهێنا، ئەو کاتە جیابوونەوە پێویستە.

٤. هەر کاتێک سەلمێنرا، کە ژنەکە کاری ناپاکی و خیانەتی هاوسەرگیریی ئەنجامداوە، ئەو کاتە هاوسەری دووەم بۆی هەیە، داوای جیابوونەوە بکات، یان بەپێچەوانەوە، ئەگەر پیاوەکەش لەگەڵ ژنێکی تردا بەدڕەوشتی بکات، ئەو کاتە

ژنەکەی بۆی هەیە، پیاوەکە بداتە دەست دادگا و داوای جیابوونەوەی لێبکات.
لەگەڵ ئەوانەشدا، لە ئایینی (زەردەشت) یدا، چەند شتێکی تریش هەیە، کە دەبنە هۆی جیابوونەوەی هاوسەرگیریی لەوانە، ئەگەر هاتوو ژنەکە دوژمن بشارێتەوە و مێردەکەی ئاگادارنەبێت، یان جادو و جادوکاری بکات، یاخود فێری ببێت. هەر کاتێک بۆ ماوەی (٣) ساڵ هاوسەری ژنەکە لە ڕووی داراییەوە پێداویستی بۆ ژنەکەی دابیننەکرد، یاخود ئەگەر هاتوو مێردەکە بۆ ماوەی (٥) ساڵ دیار نەمابێت، یان پیاوەکە لە پیاوەتی کەوتبێت. ئەوانەش دەبنەهۆی جیابوونەوەی هاوسەرگیریی، لە ئایینی (زەردەشت)یدا.

## ڕێوڕەسمی (کشتی) پشتێن بەستن لە ئایینی (زەردەشت) دا

ئەو نەریتە لەپێش (زەردەشت) ەوە لەناو ئارییەکاندا باوبووە، دواتر (زەردەشت) پەیامبەر بڕیاری فەرمی لەسەرداوە. لەئاییینی (زەردەشت) دا، کشتی یان پشتێن بەستن نیشانەی بەندایەتی ئاهورامەزدایە، کە پشتێن لەسەر کراسی ئایینیەوە دەبەسترێتەپشت، یەکێکە لە ئەرکە سەرەکییەکانی ئەو ئایینە و دەبێت (زەردەشت) ییەکان لە هەموو کاتێکدا، ئەو پشتێنەیان لەپشت بێت، چونکە لە ئاییینی (زەردەشت) یدا، نەبەستنی پشتێن، یەکێکە لە تاوانە گەورەکان. لە کاتێکدا منداڵی کوڕ دەگاتە تەمەنی (٧) ساڵی، دەبێت پشتێن ببەستێت. لەسەردەمی ژیانی (زەردەشت) دا، (زەردەشت) ییەکان بەنی پشتێنەکەیان لە خوری مەڕ و موی بزن و لۆکە دروستکردووە، بەڵام ئێستا پشتێن لە خوری مەڕ دروستدەکەن. دواتر لە ڕێوڕەسمێکی تایبەتدا و بەخوێندنەوەی چەند بەشێک لە ئاڤێستای پیرۆز، کە لەلایەن موبیدێکەوە دەخوێنرێتەوە، پشتێنەکە لە پشتی منداڵەکە دەبەسترێت.
ئەو پشتێنە لە (٧٢) تاڵە بەنی خوری سپی، کە لەلایەن ژنی موبیدێکەوە دەهۆنرێتەوە، پێکهاتووە. لە ئاییینی (زەردەشت) دا، ئەو حەفتاو دوو تاڵە بەنە،

ئامازەن بۆ حەفتاو دوو بەندەکەی یەسنای ئاڤێستای پیرۆز. ئەو تاڵە بەنانەش کراون بە (٦) گوریزەوە، هەر گوریزەش لە (١٢) تاڵ بەنی تر پێکهاتوون، کە بەهەر شەش گوریزەکە، دەکاتەوە حەفتا و دوو تاڵە بەنەکە. (زەردەشت) ییەکان بڕوایان وایە، کە ئەو حەفتاو دوو تاڵە بەنە، ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ لە بەڵای ئەهریمەن دەپارێزێت. پشتێنەکە دەبێت (٣) جار بەدەوری خاوەنەکەیدا بسوڕێتەوە، ئەو سێ جارە سێ بنەماسەرەکییەکەی ئایینی (زەردەشت) دەهێنێتەوە یادی مرۆڤ، کەئەوانیش بریتیین لە (هومت - بیری باش، هوخت - وتەی باش و هورشت - کردەوەی باش)، هەروەها دەبێت پشتێنەکە (٤) چوار گرێیی لێبدرێت، کە لە گرێیی یەکەمدا، (زەردەشت) ییەکان دان بەبوونی ئاهورامەزدای تاک و تەنیادا دەنێن. لەگرێیی دووەمدا، گەواهی دەدەن، کە ئایینی (زەردەشت) ڕاستە و لەلایەن ئاهورامەزداوە، بۆ (زەردەشت) پەیامبەر هاتووە. لەگرێیی سێیەمدا، (زەردەشت) ییەکان دان بە نامە و پەیامی پەیامبەر (زەردەشت) دا دەنێن، کە ئاڤێستای پیرۆزە. لەگرێیی چوارەمدا، دان بە پەسەندکردنی سێ پایەی گرنگی ئایینی مزدیسنادا دەنێن، کە ئەوانیش بریتیین: لە (بیری باش، وتەی باش و کردەوەی باش).

مندالە کچەکانیش، دەبێت بەروانکە یان بەرهەڵبێنە لەبەربکەن، کە ئەو بەرهەڵبێنەیە، بریتییە لە بەرگێکی سپی، کە لە (٩) پارچە کوتاڵ دەدروێت. یەکێک لە مەرجەکانی ئەو بەرهەڵبێنەیە، لە ئایینی (زەردەشت) دا، ئەوەیە ژنێک کە دەکەوێتە سوڕی مانگانەوە، دەبێت لەپشتی بکاتەوە، چونکە پەیرەونەکردنی ئەو مەرجە، دەبێتە هۆی تاوانباربوون بەرامبەر بە ئایینەکە.

## مردوناشتن له ئاییینی (زەردەشت) دا

لەسەردەمی کۆندا، (زەردەشت) ییەکان مردوەکانیان نەخستوونەتە گۆڕەوە، بەڵکو لە شوێنێکی تایبەتدا بەناوی (دخمە) یان قەڵای خامۆشان، مردوەکانیان هێشتووەتەوە، هەتا گیانەوەر و باڵندەکان گۆشتی لاشەکانیان بخۆن. مەبەست لەو کارەشیان ئەوە بووە، کە زەوی بە لای (زەردەشت) ییەکانەوە زۆر پیرۆز و ڕێزدارە، پیسکردنی بەتاوانێکی گەورە دەژمێردرێت. بەپێیی نەریتێکی دێرینی (زەردەشت) ییەکان، کەسێک کە مردوە دوای شوشتن و ئامادەکردنی لەدخمەکاندا، بە ئەمانەت دایاننناوە[1]، بەڵام (زەردەشت) ییەکانی سەردەمی هەخامەنشیی، گۆڕانکاریان بەسەر ئەو نەریتەدا هێناوە، ئەوان مردوەکانیان خستووەتە ناو گۆڕەوە. دوای مردنی هەر کەسێک ئەو کاتە کەسی مرد و ڕێوڕەسمی تایبەتی بۆ کراوە، لەسەرەتاوە هەر دوو پێڵوی چاوی مردوەکە، لێکنراوە دواتر پێیەکانی لە ئەژنۆوە نوشتێنراوەتەوە، لەدوایشدا، لە ژووری مردوشتن، لەسەر تەختێکی تایبەتی مردوشتن یان لەسەر زەوی مردوەکە درێژکراوە، لە دوای ئەوە مردو شۆرەکان، کە ژمارەیان جووت بووە، (٢) یان (٤) کەس بوون، دوای شۆرین و نوێ کردنەوەی پشتوێنی مردوەکە، دواتر لەناو تابوتێک، کە (زەردەشت) ییەکان (گاهان) ی پێدەڵێن و لە دار دروستکراوە دایدەنێن، پاشان تابوتەکەیان بەڕووپۆشێکی خاوێن داپۆشیووە، چونکە لە ئاییینی (زەردەشت) دا، مردو پیسە، ئەگەر بەرهەرچییەک بکەوێت بێگومان پیسی دەکات. لە ئاییینی (زەردەشت) دا، ڕێوڕەسمی بەڕێوەبردنی دخمەی مردو، دەبێت لە کاتی ڕۆژدابێت، واتە، پێش خۆرئاوابوون بێت، مردوەکە هەموو کارەکانی ئامادەکردنی لەناو دخمەدا کۆتای پێبهێنرێت، چونکە بەپێیی ئەو ئاییینە، ئەو کارە لەشەودا باش نییە

---

تائێستاش هۆزی (گبر) لەشاری یەزدی باشووری خۆرهەڵاتی ئێران و بەشێك لە دانیشتوانی شاری کرمانیش لەهەمان وڵات و هۆزی (پارسی) یەکانیش کە بەشێکن لە دانیشتوانی شاری (مۆمبای) وڵاتی هیندستان (زەردشت) یین و پابەندی ئەو نەریتەن. لەئێستادا (١٢٠٠٠٠) سەدو بیست هەزار (زەردەشت) ی لە جیهاندا هەیە.

## دخمەی مردوناشتن، لە ئایینی (زەردەشت) دا

دخمە بەزۆری لە دەوروپشتی ئاوەدانییەکان دروست دەکرێت، لەسەر شاخی بڵند، کە چەند هەزار مەترێک لە ئاواییەکانەوە دوورە. (زەردەشت) ییەکان تەرمەکانیان لە ناو ئەو دخمەیەدا دادەنێن، هەتا گۆشت و ئێسکەکەی لەیەکتر جیادەبێتەوە، ئینجا ئێسکەکان لە کوپەیەکدا دەنێژن، چونکە لاشەی مردو پیسەو نابێت خاک و ئاو و هەوا و ئاگر پیس بکات. لەئێستادا، (زەردەشت) یە ئێرانییەکان بەو دخمانە دەڵێن: (دادگا)، هەروەها (زەردەشت) ییەکانی هیندستانیش پێیی دەڵێن: (دخمو).

دخمە شوێنێکی بازنەییە چواردەوری بە دیوارێکی بەردین گیراوە، کە لەئێستادا، (زەردەشت) ییەکان دیوارەکەی لە بەردو چیمەنتۆ دروست دەکەن، دەرگایەکیشی بۆ هاتووچۆکردن تێدا دروستدەکرێت. چێوەی دخمە، نزیکەی (١٠٠) مەترە، تەختی ناوەوەی دیوارەکە لە هەموو لایەکەوە بەرە و ناوەڕاست لێژبووەتەوە، لە ناوەڕاستی دخمەکە، بیرێکی قوڵ و پان هەڵکەندراوە، کە (ئێسکدان) ی پێدەڵێن، هەروەها لە دیوی دەرەوەی چواردەوری دخمەکەدا، چەندیین بیری تر هەیە، کە قوڵایی هەر بیرێکیان نزیکەی مەترێک دەبێت و بە بەرد هەڵچنراون. پانتایی ناوەوەی دخمە، لە دیوارەوە هەتا ئێسکدان، بە (٣) بەشی بازنەیی دابەشکراوە، بەشی یەکەمیان لە دیوارەوە دەست پێدەکات، کە شوێنی تایبەتی پیاوە مردوەکانە و گەورەترە لە بەشی دووەم و سێیەم. بەشی دووەم تایبەتکراوە بۆ ژنەکان. بەشی سێیەمیش بۆ منداڵان و کۆرپە مردوەکانە. هەر یەکێک لەو بەشانە، بەچەند پارچەیەکی بچوکتر دابەشکراون، کە هەر پارچەیەکیان بۆ مردویەک تایبەتکراوە، چەند جۆگەلەیەکی بچوک لە نێوان ئەوبەشانەدا هەڵکەندراون، هەتا ئاوی باران چڵک و چەپەڵی مردوەکان، لەو جۆگەلانەوە بخوسێنێتەوە و بیباتە ناو ئێسکدانەوە.

لە ڤەندیدادا هاتووە، (زەردەشت) یانی کۆن، دیواریان بەدەووری دخمەکاندا دروستنەکردووە، بۆ ئەوەی ڕێگە لە گیانەوەران نەگرن، بۆ خواردنی گۆشتی مردوەکان.

لە ئاڤێستای پیرۆزدا هاتووە، کە (زەردەشت) پرسیاری لە ئاهورامەزدا کردووە، چۆن مردوەکانیان بنێژن:

(ئەی دروستکەری جیهانی زیندوو ئەی ئاهورامەزدا، بۆ کوێ لاشەی مردوەکانمان هەڵبگریین و لە کوێ دایانبنێین؟).

لەوەڵامدا ئاهورامەزدا فەرموویەتی: (ئەی ئەسپیتاما (زەردەشت) بۆ بەرزترین شوێنیان بەرن، با لەوێ گیانەوەران گۆشتەکانیان بخۆن).

هەر تایبەت بەو باسە پەیامبەر (زەردەشت)، لە ئاڤێستا و لەبەشی ڤەندیدادا دەفەرمووێت: (تاوانێک کە لێ خۆشبوونی نەبێت، ناشتنی مردوەکانە لەناو زەویدا).

هەروەها لەئاڤێستاشدا هاتووە، کە (زەردەشت) سوتاندنی مردوی بە تاوانێکی گەورە داناوە.

## . (رستاخێز) رۆژی دوایی لە ئایینی (زەردەشت) دا

لە ئایینی (زەردەشت) دا، وادەی لێبوردن دیارینەکراوە، هەروەها هەواڵی گۆڕ و رستاخێز یان رۆژی هەستانەوە، بەشێوەیەکی ئاشکرا و دیار باسکراوە، لەدوای مردنی مرۆڤەکان و کۆتایهاتنی جیهان، رۆژی دوایی دێت و مردوەکان زیندو دەبنەوە، هەمووان لەبەرامبەر رۆژی لێپرسینەوەدا دەوەستن، دوای مردنی هەر کەسێک، لەورۆژەدا لێپرسینەوە لە کاروکردەوەکانی پێش مردنی دەکرێت، تەرازوی دادپەروەری دادەنرێت، کە خودی ئاهورامەزدا خۆی سەرپەرشتی کارەکە دەکات و هەڵسەنگێنەری تەرازوەکەیە و تاوانەکان کێش دەکات.

بەپێیی ئەو ئایینە، گیانی مرۆڤ دوای مردن، (٣) رۆژ لە لای لاشەکەی دەمێنێتەوە، لەدوایدا، بایەک لە باکوورەوە هەڵدەکات، کە بۆنخۆشە، بۆ پیاوچاکان، هەروەها بۆگەنیشە، بۆ پیاوخراپان، دەبێت هەموو گیانێکی چاک یان خراپ لە رۆژی هەستانەوەدا بەسەر پردی (چینڤات)، پردی جیاکەرەوەدا تێپەڕببێت، کە ئەو پردە، بەسەر دۆزەخدا راکێشراوە، لەوسەریشەوە بەدەرگای (ئنهو وهیشت)،

واتە، بەهەشت کۆتایی دێت، لە کەناری ئەو پردەدا، دوو ئەمشاسپەندانی لێپرسینەوە تەرازووی داد هەڵدەواسن و دەست بە لێپرسینەوە دەکەن.
فروهەر یان گیانی مرۆڤ، کە یەکێکە لە (٥) هێزەکەی ناو لەشی مرۆڤ، بۆ کردارچاکەکان، لەشێوەی کچێکی بەژن جواندا دەردەکەوێت، بەڵام بۆ گیانی بەدکاران بەشێوەی پیرەژنێکی ناشرین خۆی دەنوێنێت. لەسەر ئەو پردە نامەی کرداری گیانەکان دەخوێنرێتەوە، هەر لەوێدا، هەموو کردارەکانی باش و خراپ دیاریدەکرێن. ئەگەر چاکەی گیانەکە، لە خراپەکەی زیاتر بوو، ئەوا ئەو پردە بۆ خاوەنەکەی بەیارمەتی (زەردەشت) پەیامبەر پان و پۆڕ دەبێت، هەتا بتوانێت بەئاسانی بەسەریدا بپەڕێتەوە، لەدوای پەڕینەوە بەسەر پردەکەدا، پیاوچاکان لەلایەن دوو فریشتەوە، کە نووسەری کردارە باشەکانی ئەون، دەڕوات بۆ شوێنی تایبەتی و دەگاتە جیهانی ڕوناکی. بەوتەی گاتەکان لە خانەی ئاوازەکاندا، کە ئەو شوێنە هەوارگەی باوەڕدارانە ڕاستکاران جێگایەک هەڵدەبژێرن، کە ئەو شوێنە جێگای خۆشییە، سەرزەمینیی وتە و بیر و کردەوەی چاکەیە و هیچ کاتێک خۆری لێئاوا نابێت. کردار چاکەکان لەوێدا لە بەزەیی و خۆشی بەهرەمەند دەبن، لەگەڵ یاران و هاوڕێ بەختەوەرەکانیاندا ڕۆژگار بەسەردەبەن، بەڵام ئەگەر خراپەی گیانەکە، لە چاکەکەی زیاتر بوو، ئەوا ئەوکاتە پردەکە لە موو باریکتر و لە دەمی شمشێر تیژتر و ناسکتر دەبێت، هەتا گیانەکە دەکەوێتە ناو قوڵایی ئاگری دۆزەخەوە، بەپێیی گاتەکان دۆزەخ یان خانەی درۆ، شوێنێکە بەناوی شوێنێکی ناخۆشەوە ناونراوە، لەوێدا دەرگایەکی دۆزەخ بۆ گیانەکە دەکرێتەوە، کە ئەو جێگایە، شوێنی درۆزنەکانە، شوێنی سزادانی هەمیشەیی تاوانبارەکانە. سەرزەمینێکە بۆگەنی لێهەڵدەستێت و پڕیەتی لە پیسی و خاک و خۆڵ، لە قوڵایی تاریکاییەوە، هاواری شیوەن و ناڵەی خەم دەگاتە گوێیی مرۆڤ. هەر کەسێک بکەوێتە ئەو شوێنەوە، تەنیا بە ئەشکەنجەی هەمیشەیی سزادەدرێت، بەدکاران هیچ ڕێگا و شوێنێک شک نابەن، تا لێوەی هەڵبێن. لەناو ئەو بۆشاییە بێپایان و تاریکەدا، کە شوێنی

ئەهریمەنە و سەرما و بایەکی وشک و بۆگەن هەیە، چەندین بیری ترسناکی تێدایە، چەندین جۆرە گیانەوەری تێدایە، کە گیانی بەدکاران لەت و پەت دەکەن.

لەوبارەیەوە (زەردەشت) دەفەرمووێت:

(ئیرادەی مرۆڤ تەنها هۆکاری دیاریکردنی چارەنوسی کۆتایی مرۆڤە و بەس).

دواتر تاوانباران دوای چەشتنی سزای تاوانەکانیان لەماوەیەکی دیاریکراودا ئازاد دەگرێن.



فروهەر

# سەرچاوەکان

١. ئابادانی، عەبدوڵا مویلغی: مێژووی ئایینی (زەردەشت)، و: وریا قانع، چاپی دووەم، خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی قانع، سلێمانی ٢٠٠٤.
٢. ئێزەدی، مێهرداد: ئایین و تایفە ئایینی یەکان لە کوردستان، و: لە ئینگلیزییەوە کامەران فەهمی، بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك)، سلێمانی ٢٠٠٢.
٣. ئیحسان نوری پاشا: مێژووی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد. و: حەمە کەریم عارف، چاپی یەکەم ١٩٩٨.
٤. بیگلەری، هورموزی: چیانشینانی زاگرۆس، و: حەمەی حەمە سەعید، سلێمانی ٢٠٠١.
٥. بورکای، کەمال: کوردستان لە سەردەمی باستانەوە تاکۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم، و: لە یۆنانییەوە عەلی فەتحی، چاپی یەکەم، دەزگای وەرگێڕان، هەولێر ٢٠٠٨.
٦. تابانی، حەبیبوڵا: هاونەتەوەیی قەومی کوردو ماد، و: جەلیل گادانی، چاپخانەی تیشك، سلێمانی ٢٠٠٥.
٧. تەبیبی، حیشمەتوولا: ئایین و زمان و ڕەچەڵەکی کورد، و: ڕەفعەت مورادی، بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، زنجیرە (٥٩٣)، سلێمانی ٢٠٠٨.
٨. چامپدێر، ئەلبێرت: کۆرشی مەزن، و: بۆ فارسی محەمەد قازی، و: بۆ کوردی دلاوەر عەبدوڵا، چاپی یەکەم، چاپخانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی قانع، سلێمانی ٢٠٠٦.
٩. حەکیم زادە، فەرەیدون: سەردەشت لە ئاوێنەی بەڵگەنامە مێژووییەکاندا، و: لە فارسییەوە حەمە ڕەسوڵ حەسەنپور، چاپی یەکەم، بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان ٢٠٠٧.
١٠. خودادادیان، د. ئەردەشێر: ئارییەکان و ماددەکان، و: عەلا نوری بابە عەلی، چاپی یەکەم، چاپخانەی بەدرخان، سلێمانی ٢٠٠٣.
١١. خۆشحاڵی، بێهزاد: فیلۆلۆجیای زمانی کوردی و مێژووی کوردستان، و: مستەفا غەفوور، چاپی یەکەم، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی خانی دهۆك ٢٠٠٨.
١٢. د. کەیوان ئازاد ئەنوەر: مێژووی ئایینەکان، سلێمانی، ساڵی ٢٠٠٩.
١٣. دیاکۆنۆف، ئیگۆر میخائیلۆڤیچ: میدیا، بورهان قانیع لە فارسییەوە کردویەتی بە کوردی، چاپی سێیەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٨.
١٤-دەوڵەت شاهی، عیمادەدین: وەرگیرانێك لەسەر فەروەردین یەشتی ئاوێستا (زەردەشت) ی کورد، و:حەمە سدیق میرزا، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٥.
١٥. دۆن ناردۆ: ئیمپڕاتۆریەتی ئاشوور، و: لە فارسییەوە یادگار حەمە غەریب، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی٢٠٠٨.

١٦. د. جەماڵ ڕەشید ئەحمەد: کەرکوك لە چەرخەکۆنەکاندا، و: حەسەن جاف، چاپی یەکەم، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی ٢٠٠٨.
١٧. ڕنولیت، ماری: ئەسکەندەری مەزن، و: بۆ فارسی ئەبوقاسم حالت، و: بۆ کوردی عومەر ڕەسوڵ خدر شینکیی. چاپی یەکەم، خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی قانع-٢٧-سلێمانی٢٠٠٦.
١٨. رزی، هاشم: (زەردەشت) و ئامۆژگارییەکانی، و: م. گۆمەیی، چاپی دووەم، سلێمانی٢٠٠٠.
١٩. ڕەحیم سابیر: مێژووی ماد، چاپی یەکەم، چاپخانەی گەنج، سلێمانی٢٠٠٥.
٢٠. زەکی بەگ، محەمەد ئەمین: خولاسەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان لەزۆر قەدیمەوە تا دەوری ئەمڕۆ، ئامادەکردنی: ڕەفیق ساڵح، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر٢٠٠٦.
٢١. سەقزی، بابان: (زەردەشت) هیوای ڕزگاری، بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، زنجیرە (٤٤١) ٢٠٠٦.
٢٢. سەقزی، بابان: گاتا سرودە پیرۆزەکانی (زەردەشت)، بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، زنجیرە (٤٤٨) ٢٠٠٦.
٢٣. سەید کەماڵ ئیبراهیمی: کوردستان پێش لەڕوخانی نەینەوا، بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، زنجیرە (٦١٠)، سلێمانی٢٠٠٨.
٢٤. سەرسام، عەبدولخالق: میتۆلۆژیای (زەردەشت) ی و شوێنەوارەکانی لە کوردستاندا، وەزارەتی ڕۆشنبیری زنجیرەی کتێبی گیرفان ژمارە (٢٠) هەولێر٢٠٠٦.
٢٥. شەریعەتی، دکتۆر عەلی: ئایینی (زەردەشت)، وەرگێڕان و ئامادەکردنی: شەهرام ڕەشید قادر، چاپی یەکەم، هەولێر٢٠٠٥.
٢٦. قەفتان، ساڵح: مێژووی گەلی کورد لەکۆنەوە تا ئەمڕۆ، چاپی دووەم، چاپخانەی ئۆفیسی شڤان، سلێمانی٢٠٠٤.
٢٧. کەیوان ئازاد ئەنودر: چەردەیەك لە مێژووی کورد، چاپی یەکەم، سلێمانی٢٠٠٦.
٢٨. کوردستانی، محەمەد مەردۆخی: مێژووی کورد و کوردستان، و: عەبدولکەریم محەمەد سەعید، چاپی دووەم، بڵاوکراوەی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا، زنجیرە (١١٢) ٢٠٠٧.
٢٩. گۆران، خەسرەو: کوردستان لەمێژوودا چاخەکۆنەکان (١٠٠هەزار ساڵ پ.ز-٤٠٠ی زایین)، و: ئاسۆ کەریم، بەشی یەکەم، هەولێر ٢٠٠١.
٣٠. لەمپ، هارۆلد: ئەسکەندەری مەکەدۆنی، و: عەلی ئەکبەر مەجیدی، چاپی یەکەم، چاپەمەنی گەنج، سلێمانی ٢٠٠٦.
٣١. مەزهەر، سلێمان: چیرۆکی ئایینەکان، و: لە عەرەبییەوە لوقمان حاجی قادر، چاپی یەکەم، چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی٢٠٠٨.
٣٢. مەخدووم، مەنسوور: گرنگی کورد و کوردستان لە قۆناغە مێژووییەکانی ئێران تا

سەردەمی ئەفشارییە، و: ڕەفعەت مورادی، چاپی یەکەم، بەرگی یەکەم، خانەی وەرگێڕانی سلێمانی، چاپخانی ڕوون٢٠٠٧.
٣٣. (مەلا عەلی)، عەبدوڵا قەرەداغی: زەرتەشت، چاپی دووەم، سلێمانی٢٠٠٧.
٣٤. (مەلا عەلی)، عەبدوڵا قەرەداغی: کورد لە سەرچاوە مێژوویەکاندا، چاپی یەکەم٢٠٠٨.
٣٥. مەغدید حاجی: لە (نوربیللۆم و ئەربەئیلۆ) وە بۆ هەولێر، چاپی یەکەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر ٢٠٠٩.
٣٦. مفید رائف، مەحمود عابد: مێژووی دەوڵەتی ساسانی، و: عەبدوڵا فازل گەرمیانی، چاپی یەکەم، چاپخانەی سایە، سلێمانی ٢٠٠٩.
٣٧. هاوس هۆڵد، جەعفەری: گزنەفۆن گەڕانەوەی دە هەزار یۆنانی، و: بۆ فارسی مەنوچێهری ئەمیری، و: بۆ کوردی کامیل ئەحمەد بەگ، چاپی یەکەم، چاپخانەی بزافی ڕۆشنبیری سلێمانی، ٢٠٠٦.



**عومەر ئیسماعیل مارف**

لە ١٩٨١/١٠/١٧ لە ئۆردوگای تووەسورانی نزیك شاری قەڵادزێ لەدایکبووە.

ئێستا ئەفسەرە، بە پلەی ملازمی دوو لە بەڕێوەبەرایەتی بەرگری و فریاکەوتنی پشدەر.

لەساڵی ٢٠٠٥ ەوە دەنوسێت و تا ئێستا زیاتر لە ٧٠ بابەتی جۆراوجۆری لە شێوەی وتار و ڕیپۆرتاژ لە ڕۆژنامەکانی وەك: کوردستانی نوێ، ئاسۆ و ئاوێنە و گۆڤارەکانی قەڵادزێ، ڕێبەری پێشمەرگە، بابان، شەن، هاوبەشی و پشدەر و سایتی قەڵادزێ دا بڵاوکردۆتەوە.



**Dewletî Mad**

**700-550 Pêşzayîn**

**Nûsînî:**

**Omer Îsmaîl Marf**

**Pêdaçûnewey:**

**D. Leywan Azad Enwer**